PDF 4 KURD

# نۆ
# کورتە چیرۆکی نوێی
# پەرییەکان

نووسینی:
دوکتور میشێل وێست

وەرگێڕانی لە ئینگلیسییەوە:
عەلی جەوشەنی «سەرۆک»

PDF 4 KURD

نێوەرۆک لاپەڕە

PDF 4 KURD

## پێشەکییەک بۆ وەرگێڕان:

تا ئێستا پێناسەیەکی یەکدەست بۆ وەرگێڕان نەکراوە، گرینگ ئەوەیە ئەگەر وەرگێڕان هەمان وەرگەڕاندنەوەی واتا و چەمک ( concept )ی نووسراوە یان وتەیەک لە زمانی بنەماوە ( source language ) بۆ سەر زمانی مەبەست ( target language ) بێ، ئەوە باشترین جۆری وەرگێڕان ئەو دەمە دێتە دی کە بتوانێ ئەو کاریگەرییە ( بۆ سەر خوێنەر یان گوێگر ) لە زمانی بنەماوە بۆسەر زمانی مەبەست رابگوێزێ یان بە شێوەیەکی ئاسانتر, وەرگێڕان بریتییە لە وەرگەڕاندنەوەی دەقێک ( text ) لە زمانی بنەماوە بۆ سەر زمانی مەبەست، بێ ئەوەی کە هیچ گۆڕان و تێکچوونێک لە شێوە ( روخسار form ) و واتا ( meaning )دا بێتە گۆڕێ، ئەم پێناسەیە ( definition ) بە تەواوەتی دەچێتە خانەی تیۆریکەوە، چونکو هیچ پەیامێ بێ گۆڕان لە روخسار و واتادا لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی‌تر راناگوێزرێ، ئەم پرسە دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتە ( structure ) جیاوازییەکانی زمانەکان، کە هەر زمانێ وشەمەنی ( vocabulary ) تایبەت بە ( زمانی ) خۆی هەیە، هەر یەک لەم وشانە هەڵگری واتا یان کۆمەڵە واتای تایبەت بە خۆن. هاوهاتەیی ( collocation ) وشەکان لە هەر زمانێکدا بەندە بە کۆمەڵە ڕێسا ( rule )یەکی تایبەت و لە کۆتاییدا، ئەو رستانەی کە لە هەر زمانێک بەکار دێ، دەتوانێ واتا یان دەستە واتایەکی تایبەت بە خۆی هەبێ کە لە ئەنجامدا راگوێزانی هەر یەک لەو رستانە بەبێ دەسکاری، لابردنی هێندێ لە تایبەتمەندییەکان، یان خستنە سەر ( پێوە زیاد کردن )ی تایبەتمەندییەکانی تر ناگونجێ، بەم شێوەیە لە پاڵ وەرگێڕان وەکوو پیشەیەکی بەدرێژایی چەند هەزار ساڵە، زانستێ بە نێوی وەرگێڕانناسی ( translatology )یش پێکهات تا لە باری تیۆرییەوە لێی بکۆڵێتەوە. وەرگێڕان بە گشتی لکێکە لە زمانەوانی کرداری ( کارپێکراو applied linguistics ) کە لە زانکۆکاندا بە شێوەیەکی جیا دەخوێنرێ. لێکۆڵینەوەی تیۆریکی بنەماکانی وەرگێڕان بە بێ زمانەوانی ( linguistics ) لەنگە و دەبێ کەسی وەرگێر ئاگادارییەکی تا رادەیەکی زۆر لە باری بنەما زمانەوانییەکانەوە بێ تا بتوانێ تێڕوانین، کار پێکردن و بۆچوونێکی زانستییانەی بۆ وەرگێڕان هەبێ چونکو بێ ئەم زانستە وەگێڕانێکی ناهونەری و ترازاو لە چوارچێوە و داڕشتنی تکنیکی وەرگێڕان بە دەستەوە دەدرێ. نایدا ( Nida ) لە ١٩٧٥دا تیۆرییەکی خستە روو کە تیشک دەخاتە سەر ئەوە کە وەرگێڕ دەبێ لە زنجیرەیەکی داخراو، بەڵام رەوت و پرۆسێسێکی تاوتوێکردن، راگوێستن و ڕێکخستنەوە ( restructuring ) ڕەچاو کا، یان بە شێوەیەکی تر، وەرگێڕ دەبێ لە سەرەتادا بیر لە دەقی زمانی بنەما بکاتەوە و بیخاتە ژێر تیشکی پیاچوونەوە و دوای دانانی بەرامبەر ( equivalent )ی شیاو و گونجاندنی دەقەکە بە پێی رستەسازی ( syntax ) زمانی مەبەست، دەست بداتە خولقاندنەوە ( recreation ) و نوێکردنەوە، بە جۆرێ کە بۆنی وەرگێڕانی لێنەیە.

دیسان، نایدا لە کتێبی «principles of translation as exemplified by Bible translation» پێی وایە کە وەرگێڕان دەبێ خولقاندنەوەی دەق لە زمانی بنەماوە بۆ سەر زمانی مەبەست بێ بە شێوەیەک کە بەرامبەرە دانراوەکان تا ئەو جێگایەی بلوێ، لە گەڵ دەقە سەرەکییەکە یەکتر بگرێتەوە و تەراز دەربێ. ئەو دەمەیە وەرگێڕان ئەنجامدانەوەیەکی ( efficiency ) باش و هونەری دەبێ و هەر وەکوو کۆڕنی چوکاڤسکی ( Kornie Chukovskii لە کتێبەکەیدا ( the art of translation ) دەڵێ: «وەرگێڕان هونەرێ نییە بەڵکو هونەری ( سەرووی ) هونەرەکانە.» جێی خۆیەتی یادێ لە شۆڕشە زمانەوانییەکەی نوام چامسکی ( Noam Chomsky ) ( لە ١٩٦٥ بەم لاوە ) بکەینەوە کە پاڵنەری ( motive ) سەرەکی بوو بۆ گۆڕانکاری پێکردن لە بواری زمان و دوای بە دوای ئەودا،

PDF 4 KURD

وەرگێڕان لە نێوان زمانەکاندا، کە کۆمەڵێ بیرۆکەی ( idea ) نوێ لە بواری وەرگێڕان و هونەرەکانی، کاردانەوەیەکی ( reaction ) ئەو شۆڕشە بنچینەییە بوو کە کارێکی وای کرد ئێستاش بنەمایێ بێ بۆ تیۆریەکانی وەرگێڕان کە لە لایەن شارەزایانی ئەو بوارەوە دەخرێتە روو.

بە کورتی جۆرەکانی وەرگێڕان بەم شێوەن:

A. وەرگێڕانی زارەکی: ( interpretation ) A. ١ وەرگێڕانی هاوکات ( simultaneous ).

A. ٢ـ وەرگێڕانی ناهاوکات ( consequitive )

B. وەرگێڕانی نووسراوە ( translation )

B1. وەرگێڕانی پێوەندیدار( communicative )=وەرگێڕانی خوێنەرخواز (adaptative). B2. وەرگێڕانی واتایی ( semantic ) = وەرگێڕانی نووسەرخواز (receptive)

یەکەی وەرگێڕان ( unit translation ) بریتییە لە: بڕگەیێ لەو زنجیرە کە وەردەگێڕدرێتەوە و لە لایەن وەرگێڕ وەکوو یەکەیێ بۆ بەرامبەر دانان لەبەرچاو دەگیرێ.

ئەگەر یەکەی وەرگێڕان وشە بێ، وەرگێڕانەکە وشە بە وشە ( literal ) دەبێ، کە بە بۆچوونی زۆربەی وەرگێڕ و تیۆریسییەکانی وەرگێڕان، ناهونەرییە و ناتوانێ وەرگێڕانێکی باش و تکنیکی بێ. ئەم شێوە زۆر لە وەرگێڕانی واتاییەوە نزیکە. ئەگەر پاراگراف ( paragraph ) وەکوو یەکەی وەرگێڕان هەڵبژێردرێ، وەرگێڕانەکە دەچێتە خانەی وەرگێڕانی ئازادەوە ( free translation - rendering ) کە زۆر جار بابەتێ لە زمانی بنەماوە لە وەرگێڕان نایێ، ( untranslatable ) تەنیا چارە وەرگێڕانی ئازادە. ئەم جۆرە بە لای وەرگێڕانی پێوەندیدارەوە لار دەبێتەوە. ئەگەر رستەش کرایە یەکەی وەرگێڕان، ئەنجامەکەی وەرگێڕانی ئاساییە کە باشترین یەکەی وەرگێڕان لای زۆربەی شارەزایانی ئەو بوارە، یەکەی وەرگێڕان، هەمان رستەیە چونکو لەو وەرگێڕانەدا رێساکانی رێزمان، رستە سازی و شێوازی رێکخستنی وشەمەنی زمانی مەبەست بە سەر دەق و وەرگێڕدراوەکەدا، بە تەواوەتی رەنگ دەداتەوە و تایبەتمەندییەکانی زمانی دەردەکەون.

لە دواییدا وەرگێڕان لەمڕۆکەدا لە کوردستان لە قۆناخی سەرەتایی خۆیدایە و تا ئێستا بە داخەوە هیچ پلان یان پرۆژەیەکی بەربڵاوی بۆ دانەڕێژراوە، تەنانەت نەخراوەتە نێو چوارچێوەیەکی تیۆریزەیشن. جا ئەوەیە کە دەبێ لەمەو بەدوا بە تەنگی زمانە شیرینەکەمانەوە بێین و نەیەڵین زیاتر لەوە لە کاروانی وەرگێڕان بەدوا بکەوێ. خودا یار بێ بیکەینە ستراتیژی و بزووتنەوەیەک بۆ نەوەکانی داهاتوومان تا لەم تەنگژەیە وەرگێڕانییەدا رزگارمان بێ.

بە هیوای ئەو رۆژە

عەلی جەوشەنی «سەرۆک»

**سەرچاوەکان:**


١. باطني؛ دکتر محمدرضا. پیرامون زبان و زبان‌شناسی، انتشارات فرهنگ معاصر، ١٣٧١
٢. صفوی؛ دکتر کورش. درباره ترجمه، انتشارات کتاب ماد، ١٣٨٠
٣. حدادی؛ محمود. مبانی ترجمه، انتشارات جمال الحق، ١٣٧٠
٤. میرعمادی؛دکترسیدعلی، تئوریهای ترجمه‌وتفاوت ترجمه‌مکتوب همزمان، بهارستان،١٣٦٩
5. Nida; Eugene A. the theory and practice of translation. Leiden, United Bible socirties, 1974
6. Nida; E A. principles of translation as exemplified by Bible translation, 1959
7. Chukovskii; Kornei. The art of ranslation, 1984

PDF 4 KURD

# لە نێو ئاورەکە



A . جـەک ... کـورێکی چکولانـە بـوو. لـە ئینگلـەنـد دە ژیـا. نەیدەتوانی بـە رێگـادا بـڕوا چونکـو پشـت ئێشـەی بـوو و هەمیشە دێشا. لە پاڵ ئاورەکە دانیشت. زۆر نارە حـە ت بـوو. دایکی چووبووە دە رێ. وتی: حەز بە تە نیـایی ناکـە م. هـیچ هەڤاڵ و رفێقێکم لە گە ڵمدا نییـە. ئـەمجار دە نگی کـە سـێکی بیست :

- لێرەم!

چـاوی لێکـرد و پەرییـە کـی سـووری چکولـە ی دی ، لـە سەرئاورە کە دانیشتبوو.

وتی: کێی؟

پەرییە کە وتی: پەرییە کی ئاورینم

جەک وتی: یانی پەری ئاوریش هە یە ؟

PDF 4 KURD

پەرییە کە وتی: بە لێ، پەرییە کانی ئاوری وئاویش هە یە. .. من پەرییە کی ئاورینم ... دەتەوێ ولاتی ئاورین ببینی؟
جەک وتی: ها .... بەڵێ!

**B**. پەرییەکە وتی « دە ستتم دە یە ».
بە ڵام جەک وتی: « ئە گە ر بە نێو ئاورە کە دابڕۆم دەسووتێم»
پەرییە کە وتی «نا، ناسووتێی دە ستتم دە یە.»
جەک دە ستی پەرییە کە ی گرت. کاتێک جەک دە ستی پەرییە کە ی گرت چکۆلە و چکۆلە تر بووەوە. پەرییە کە ش گەورە و گە ورە تر دەهاتە بەرچاو. پەرییەکە جەکی بە نێو ئاورەکەدا برد .
جەک لە هەموو لایێکەوە گردەگەورەکان کە لە حاڵی سووتانا بوون چاوپێکەوت. پەرییەکە وتی:«لە گەڵما وەرە. بە نێو ئاورەکەدا دەچینە خوارێ و ماڵی پادشای ئاوریش دەبینین.» بەنێو کونێک لە ئاورەکەدا چوونە خوارێ و بەرەو باخێکی جوان هاتن.
هەموو گوڵەکانی ئەو باخە لە ئاور بوون . لە ئاورێن (ئاگربازی) دەچوون. ماڵێکی گەورە لەو باخەدا بوو.


ئاگربازی

دیوارەکانی سوور و گڕاوی بوون و درگا و پەنجێرەکانی لە ئاور دروسکرابوون.




C. پەری ئاورەکە دوور کەوتەوە .جەک لە باخی پادشای وڵاتی ئاگرا (ئاگرستان) دانیشت. پاشان شازادەیەکی جوانی لە حاڵی رۆیشتنا لەباخەکەدا دی. چاوەکانی گڕاوی بوون و قژی یەکجار سوور وەکوو ئاور وابوو. زۆر جوان بوو،بەڵام دەموچاوی زۆر گرژ دیار بوو و هاتە نزیک جەک.

جەک وتی: «ها شازادە بۆ ئەوندەنارەحەتی؟»

وتی:«نارەحەتم چونکو حەز لە شازادەی ئاو دەکەم و ناتوانم پێی بگەم.»

جەک وتی«بۆ شوو بەشازادەی ئاو ناکەی ؟»

شازادە وتی: شوو بە شازادەی ئاو ناکەم چونکو ئەگەر دەستی بگرم، دەمرین ؛لە بەرئەوەی ئاور، ئاو دادەمرکێنێ و ئاویش، ئاور دادەمرکێنێ»

D. دوای بڕێ پەری ئاورین گەڕایەوە .وتی:«نابێ لە گەڵ شازادەیا قسە بکەی،پادشا زۆر توورە دەبێ. ئەو بەوە توورەیە لە شازادە، چونکو حەز لە شازادەی ئاو دەکا و

لێی دەوێ کە شوو بە شازادەی ئاور بکا. ئەگەر بێتو ببیستێتەوە لەگەڵ شازادە قسەت کردوە، زۆر تووڕە دەبێ. زوو وەرە.»



پاشان پەری ئاور دەستی جەکی گرتەوە و خێرا دوورکەوتنەوە و بەنێو ئاورەکەدا دەرچوون.جەک چاوەکانی بەست.... کاتێ جەک چاوەکانی هەڵێنا،لە پێشەوەی ئاورەکەدابوو.جەک بۆ چەن رۆژێ چاوی لە ئاورەکە کرد و ویستی دیسان پەری ئاورین کە ببینێ، بەڵام پەری ئاورەکە نەهات. باران دەباری و چاوی لە باران دەکرد کە لە دەرەوە دەباری.

شازادە دەیویست دیسان پەری ئاوەکە ببینێ، بەڵام کەسی نەدی.

E. پاشان شەوێ جەک لە پێشەوەی ئاورەکەدا خەوتبوو، دەنگی کەسێکی بیست.چاوەکانی هەڵێنا و تەماشای کرد،چاوی بە شازادەی ئاور کەوت کە لە سەر (تۆپی)گڕی

PDF 4 KURD

ئـاورە کـە دا دانیشـتبوو.ئـاور سـە رتـا سـە ری لـە شـی داگرتبوو،زۆر جوان دەینواند .

شازادە وتی«برێ دار و چرپی زۆرتـر بنـێ سـەر ئـاورە کـە ، سەرمامە»

جەک وتی:«یە کجار جوانی»

شازادە وتی:«ئە من؟ . . . دەمەوێ شتێکم بۆ بکەی »

جەک وتی:«بە لێ ،هە ر شـتێ بلـێی بـۆت دەکـەم» شـازادەی ئاور وتی:«دەمەوێ بە شازادە ی ئاو بلێی تا بێ و بمبینێ.»

جەک وتی: «چۆن بیدۆزمەوە؟»

شازادە وتی:«پە نجێرە کە بکە وە و چاوەڕێ بمێنە وە.»

F. جەک پە نجێرە کە ی کردە وە و باران هاتـە نێـو دیـوە کـە. پاشـان شـازادە کـە دەسـتیکرد بـە بـانگکردن و هـە رای لـە شازادە ی ئاو کرد . بارانێکی زۆر بە نێو پە نجێرە کەدا هاتـە ژوورێ و لە بارانە کە وە شازادە ی ئاو دە رکە وت، چاوەکانی وە کوو دە ریا شین بوون . . . قژی شـین بـوو . . . جلە کـانی وەکوو ئاوی شینی رووبارە کان وابوو. کاتێ شازادە ی ئاوی دی، بە رە و ئاورە کە هە ڵات.

«زۆر نزیک ئاورە کە مە بە وە!»شازادە گریا،«یانی دەمـرین . کە سێ هە یە کە دە توانێ یاریدە مان دا . . . پیـاوی بـە فـری. ئەو زۆر زۆر دوور لە وڵاتێ کە هـە میشـە بـە فـری لێیـە، دەژی دەبێ کە سـێکی بـۆ لای بنێـرین.»شـازادە ی ئـاو وتـی:«کـێ دەتوانێ بچێ بۆ لای؟»

«من ناتوانم بچم، ئەگەر بێتو بۆ ئەو وڵاتە بچم دەبمە بەفر و دەمرم.»

شازادە (پرینسێس) وتی:«ناتوانم بچم چونکو ئەگەر بچم بۆ ئەو وڵاتە دەمرم، ئاور لە بەفردادەمرێ.»

جەک وتی:«من دەچم ،بەڵام چۆن دەتوانم بگەمە ئەوێنە.»

G. شازادەی ئاو وتی: «پەری با بانگ دەکەم . . . ئەو بۆ لای پیاوی بەفریت دەبا.»



پاشان شازادەی بای بانگ کر، بایێکی سارد هاتە نێو دیوەکە و لە بایەکە پەرییەکی چکۆلانە دەرکەوت.

شازادەی ئاو وتی:«ئەوە پەرییەکی بایە»

پەری با دەستی جەکی گرت و هەڵبەزینەوە ،جەک لەگەڵی چوولە پە نجێرەکەوە رۆیشتن و چوونە ژوور ماڵان و بەرەو کێڵگە و گردەکان. چوونە سەرەوەی تەپەکان. بەرەو دەریا هاتن و چوونە ژوور دەریا و بەرەو وڵاتێکی تر هاتن .چوونە ژوور دارستان و چۆم و شارەکان. هەوا هەر روو لە ساردی بوو.بەرەو دەریاییێکی سپی گەورە هاتن و

PDF 4 KURD

هەڵكشانە سە ر دە ريا. ئـەمجار بـەرەو وڵـاتێكی دوور كـە لـە بەفردا داپۆشرابوو،هاتن.پاشان پەری بایە كە چووە خـوار و خوار و خوارتر. لـە سـە ر نـووكی گـردێ پیـاوە بـە فرییـە كـە دانیشتبوو.

H. پەری بایەكە بە جەكی وت:«دەبێ لە پیاوە بە فرییە كـە شـتێ بپرسی. زیاتر لە شتێكی لێ نە پرسی. ئە گە ر شتێ زیاتری لێ پرسی، دەتكوژێ، پیاوێكی زۆر خراپە؛ بـەڵـام هـە مـوو شـتێ دەزانـێ.»

جـەک چـوو بـۆ لای پیـاوە بـە فرییـە كـە. پیـاوە بـە فرییـە كـە وتی:كێی؟هاتووی تا شتێ بپرسی. هەر كە سێ كـە دێ بـۆ لام شـتێ دە پرسـێ.دە تـە وێ بـزانی كـە چ شـتێ بـۆ پشـت ئێشـەكـەت بكـەی؟ دەتـەوێ بـزانی كـە دەبـێ چ شـتێ بكـە ی تـاوەكـو منالـانی تـر بـڕۆی و هەڵبێی؟»


پیاوی بەفرین

جـەک وتـی:«نا،نامەوێ ئە و ە بپرسم، . . من لە لایەن شازادە وە دێم . . ئەو دە یـە وێ شووبكا بە شازادە ی ئاو، بەڵام ئە گـە ر بێتـو ببنـە هاوسـەری

PDF 4 KURD

یـەک، دەمـرن. چونکـو ئـاو ئـاور دادەمرکێنـێ و ئـاوریش ئاو»

پیاوە بە فرییە کە وتی: «ها... نا،نا،نا،ئـەگـەر ببنـە هاوسـەری یەکتر،نامرن.»جەک وتی:«دەبێ چ بکەن؟»

پیاوە بە فرییە کە وتی:«بە شازادەی ئاو بڵێ تا دەستە کـانی شازادەی ئاور بنێتە نێو دەستە کانی و بڵێ خۆشم دەوێـی؛ ئـەمجار هـیچ کامێکیـان نـامرن. ئێسـتە هێنـدێ شـتی تـرم لێپرسە.»

جەک وتی،«نا،هیچ شتێکی ترت لێناپرسم.»

I. ئەمجار پیاوە بە فرینە کە زۆر تووڕە بوو.

جەک هەڵات و دەستی پەری بای گرت و چوونە سـەرەوە ــ سەرەوە ــ سەرەوە.

چوونە ژوور دەریا و وڵات و گرد و چۆم و دارسـتانە کـان و گـەڕانـەوە بـۆ دیـوەکـەی جـەک شـازادەی ئـاور لـە سـەر ئاورەکە دانیشتبوو. شازادەی ئاو لە نزیکی وێستابوو.

شازادەی ئاور وتی: «دەبێ چ بکەین؟ ... پێم بلـێ دەبـێ چ بکەین.»

ئـەمجار جـەک بـە شـازادەی ئـاوی وت: «تـۆ دەبـێ دەسـتت بنێیە نێو دەستەکانی و دەبێ بڵـێی خوشـم دەوێـی؛ ئـەمجار نامری»

PDF 4 KURD

شازادە (پرینسێس) وتی: بەڵام ئێمە دەمرین ... ئاو و ئاور هەر کامێکیان یەکتر دادەمرکێنن. » شازادە وتی: نا ... هەر یەک لە ئێمە دەگۆڕێ بەڵام نامرین.»

J: پاشان شازادە (پرینسێس) لە ئاورەکە هاتە خوارێ و شازادە چوو بۆ لای پرینسێس، دەستەکانی گرت و وتی: «خوشم دەوێی»

هەرا و قیژەیەکی زۆر سازبوو. جەک چاوی لێکرد و شازادەی (پرینسێس) دی کە لەو شوێنە راوێستابوو. چاوانی پرینسێس وەکوو ئاور نەبوون و شێوەی چاوانی ژنێکیان دەدا. قژی ئەوندە سوور نەبوو و وەکوو قژی



سووری ژنێک وابوو. چاوانی شازادە (میر) وەکوو ئاو شین نەبوون و شێوەی چاوانی پیوێکیان دەدا. ئەوان وتیان: « جەک! سپاست دەکەین ... تۆمان هەر لە بیر

PDF 4 KURD

دەبێ» دوایە دەس لە نێو دەس بەرەو پەنجێرەکە رۆیشتن و بەو شەوەدا چوونە دەرێ.

**K.** جەک هەموو شەوێ چاوی لە ئاورەکە دەکرد و دەیویست پەرییەکی ئاورین ببینێ بەڵام هیچی نەدەدی. چاوی لە بارانەکە دەکرد، دەیویست پەرییەکی ئاوی ببینێ بەڵام چاوی بە هیچ نەدەکەوت. شەوێک لە سەر جێگاکەی خەوی لێکەوتبوو. : پەنجێرەکە کرابۆوە چاوی لە پەنجێرەکە کرد و شازادەی ئاو و شازادەی ئاوری دی کە بە نێو پەنجێرەکەدا هاتنە نێو دیوەکە و وتیان: «جەک ئێمە گەڕاوینەتەوە و شتێکمان بۆ هێناوی کۆتێکمان بۆ هێناوی و کەواکەمان بۆت دروست کردووی جادووگەرێ پیشانی داین کە چۆنی دروست کەین ئەگەر تۆ بیکەیتە بەرت دەتوانی بە رێگادا برۆی و وەکوو منالانی تر هەڵبێی»

**L**: پاشان جەک کەواکەی کردە بەر. کاتێ کەواکەی لە بەر کرد، نەیتوانی هیچی ببینێ، چونکو کۆتێکی پەری ئاسا بوو. ژانی پشتی شکا و هیچ نەدەیێشا و توانی بڕوا و هەڵێ. یەکجار خۆشحاڵ و شاد بوو. بە شازادەی ئاور و شازادەی ئاوی وت: «سپاستان سپاسێکی یەکجار زۆر» ئەوان وتیان: «سپاسمان لێ مەکە، ئێمە سپاست دەکەین و زۆر خۆشحاڵین»پاشان دەس لە نێو دەس شازادەی پەری و شازادەی ئاو بەو شەوە بۆ لای پەنجێرەکە رۆیشتن.

# پشیلەکە لە گەڵ کەوشەکاندا



**A**. رۆژگاری پیاوێ سێ کوڕ و ماڵ و کەر و پشیلەیەکی بوو. وەختێ مرد ماڵەکەی دایە یەکەم کوڕی، کەرەکە بۆ کوڕێکی تر و پشیلەکەش بۆ کوڕەکەی تر. کوڕەکەی تر (کە پشیلەکەی بوو) نێوی تام (Tom) بوو تام بۆ پشیلەکە زۆر باش بوو پشیلەکەش خۆشی دەویست. تام وتی: «لە گەڵ پشیلەیێ چی دەتوانم بکەم؟ نا کەسێک نایەوێ پشیلەیەک بکڕێ» پاشان پشیلەکە چاوێکی هەڵێنا و ئەمجار چاوەکەی تری



کردەوە و وتی: «دەمەوێ یاریدەت دەم بیرم کردۆتەوە کە چۆن دەتوانم یارمەتیت دەم، دەبێ جووتێ کەوش و تورەکەیەکم بۆ بکڕی جووتێ پاشان زۆر بەرگی جوانت دەبێ

PDF 4 KURD

و لە ماڵێکی گەورەدا دەژی و شازادە دەبێتە ژنت»

**B**. پاشان تام جووتێ کەوش و توورەکەیەکی کڕی و دایە پشیلەکە. پشیلەکە کەوشەکانی کردە پێ و بڕێ لەت و کوتی نانی لە نێو توورەکەکەدا دانا ئەمجار توورەکەکەی لە نێو دارستانەکەدا دانا و خۆی شاردەوە پاش ماوەیەکی کەم کەروێشکێک هات و چووە نێو توورەکەکە تا نانەکە بخوا. ئەمجار پشیلەکە بە خێرایی توورەکەکەی گرێ دا و کەروێشکەکە گیری خوارد. پاشان پشیلەکە توورەکەکەی برد و بەرەو ماڵی پادشا بەڕێ کەوت. پادشا بە نێو دیوەکەدا هات پشیلەکە وتی: « ئەی پادشا! من بەردەستی شازادەی گەورە تامم و ئەو کەروێشکەکەی بۆ ناردووی »

پادشا وتی:«شازادە تام کێیە؟!

پشیلەکە وتی: « شازادە تام ؟!! یانی ناوی شازادەی گەورە تامت نەبیستووە؟!؟! هەموو کەسێ نێوی شازادە تامی بیستووە . .

پادشاکە وتی: ئاخ بەڵێ بیستوومە . . . نێوی شازادە تامم بیستووە . . . سپاسی شازادە تام بۆ کەروێشکە یەکجار جوانەکەی.

**C**. پشیلەکە رۆژێ دواتر هێندێ باڵندەی لە دارستانەکەدا گرت و چەند باڵندەیەکی بۆ ماڵی پادشا برد و وتی: « ئەی پادشا! شازادە تام ئەم باڵندانەی بۆت ناردووە» پادشا وتی: «سپاسی شازادە تام بۆ باڵندەکان . . . . سپاسێکی

PDF 4 KURD

یەکجار زۆر بۆی » پاشان پشیلەکە دەنـگ و قسـەی یـەکێ لـە بەردەستەکانی پادشای بیست. بەردەستەکە وتـی: «ئەمڕۆکـە پادشا لە گەڵ شازادە لە پاڵ چۆمەکەدا سوار (گـەمی) دەبـن» ئەمجار پشیلەکە زۆر زوو بـۆ لای تـام گەڕایـەوە وتـی:«بـەرەو چۆمەکـە بـڕۆ و بپـەڕە نێـو ئـاوە کـە بەڵـام جلوبەرگەکـەت لـە بەرێکی چۆمەکە داکەنە» بەو جۆرە تـام جلـەکانی لـە بـەرێکی چۆمەکە دانا و پەڕییە نێو ئاوەکە و پشـیلەکە جلـەکانی دوور خستەوە.

**D.** پاشـان پادشـاکە بـە سـواری بـە لای چۆمەکـەدا لـە گـەڵ شازادە هات. لە هەمان کاتدا پادشا بەرەو ئەوشوێنە هات کـە تام لە ئاوەکەدا بوو. پشیلەکە دایە گریان:هاوار ...هاوار ... شازادە تام رزگار کەن ...پادشا کە تامی لـە نێـو چۆمەکـەدا دی پشیلەکەشی دی ...پشیلەکەی وەبیر هاتەوە: بە کەسێ لە بەردەستەکانی وت: «شـازادە تـام رزگـار کـەن شـازادەبێننە دەرێ» بەردەستەکانی پادشا تامیان لە چۆمەکـە هێنایـە دەر. ئـەمجار پشـیلەکە وتـی: «ئـای ئـای هێنـدێ پیـاو جلـەکانی شـازادە تامیـان بـردووە شـازادە تـام هـیچ بـەرگێکی نییـە. دەستێ بەرگ بدەنە شازادەی گەورە تام » پاشـان پادشـاکە وتـی: «دەستێ جلوبەرگی جوان بدەنە شازادە تام »

بەو شێوەیە تام برێ جلوبەرگی جوانی کـە پشـیلەکە وتبـووی وەرگرت.

PDF 4 KURD

E. نزیک ئەو شوێنە ماڵێکی زۆر گەورەی لێبوو لە سەر نووکی تەپێ، دێوێ لەو خانووەدا دەژیا. جادووگەرێ بوو دەیتوانی خۆی بگۆڕێ و بکاتە شێرێ یان سەگێ یان ورچێ یان باڵندەیێ یان هەر شتێ. پشیلەکە بەرەو ماڵی دێوەکە بەڕێ کەوت و چووە نێو خانووەکە پاشان دێوەکە هاتەوە و پشیلەکە وتی: «زۆر کەس لە بارەی تۆوە قسەیان کردووە بیستوومە کە جادووگەرێکی گەورەی و خەڵک دەڵێن کە




دەتوانی خۆت بکەیتە هەر گیانەوەرێ یا باڵندەیێ ... ناتوانی خۆت بکەیتە شێرێ »

F. دێوەکە وتی: «دەتوانم خۆم بکەمە شێرێ» پشیلەکە وتی: «پێم وانییە بتوانی» دێوەکە وتی: دەتوانم و (لەولاوە تریش) بەو شێوەیە خۆی کردە شێرێ. پشیلەکە زۆر ترسا و هەڵات. ئەمجار پشیلەکە وتی: بەڵێ دەتوانی خۆت بکەیتە شێرێ بەڵام ناتوانی خۆت بکەیتە مشکێ. دێوەکە وتی: «دەتوانم دەتوانم ... دەتوانم خۆم بکەمە مشکێک»

PDF 4 KURD

پشیلەکە وتی: «پێم وانیە بتوانی» دێوەکە وتی: «دەتوانم و لەو لاوەتریش» بەو شێوەیە خۆی کردە مشکێک. پاشان پشیلەکە پەڕییە سەر مشکەکە و خواردی و پشیلەکە دێوەکەی کوشت .

G. کەمێ دوایی پادشا و شازادە و تام بە ڕێگاکە نزیک ماڵی دێوەکە دەهاتنە پێش، ئەمجار پشیلەکە بەرەو دەرگای ماڵەکە هەڵات و کردییەوە. بڕێ دوایی پادشا و شازادە و تام هاتن. پشیلەکە وتی: «ئەی پادشا وەرە ژووری . . . وەرە نێو ماڵی شازادە تام » ئەمجار پادشا و شازادە تام و شازادە هاتنە نێو ماڵەکە و پشیلەکەش هەموو دیوە جوانەکان و باغی جوانی پیشان پادشا و شازادە دا. پادشاکە زۆر پێ خۆشحاڵ بوو. شازادە وتی:« چ ماڵێکی جوانە!! چ باخێکی جوانە!!» پاش ماوەیێ تام شازادەی مارە کرد و لە ماڵی دێوەکەدا ژیان. دوای ئەوە پادشا مرد و تام بووە شا. پشیلەکە لە پاڵ ئاورەکەدا کە زۆر خۆشحاڵ بوو خەوی لێکەوت.

PDF 4 KURD

## دڵی شازادە ئالیس



**A**. رۆژگـارێ شـا و شـاژنێ بـوون. شـاژنەکە بـاش نـەبوو و یەکجار ساردوسڕ بوو و کەسی خۆش نەدەویست. منالێکی بــە نێــوی ئــالیس بــوو. پەرییــەکانیش شــاژنیان خــۆش نەدەویست و دەیانوت سـارد و سـڕە و خۆشـی لێمـان نایـە. شەوێک شاژن نزیک شازادە ئالیس دانیشتبوو.

شاژن وتـی: «یاریدەی هیچ کەسـم نـاوێ . . خـۆم شـاژنی ئـەم وڵـاتەم، دەتـوانم ئـەوەی کـە بمـەوێ بیکـەم . . . هـەموو شـتێ دەتوانم بکەم»

**B**. وای برێ پەرییەکی شینی چکۆلە هاتە نێو دیوەکـە و وتـی: «ئــەی شــاژن! تــۆ نــاتواتی هــەموو شــتێ بکــەی . . . تــۆ یارمەتییــەکی یــەکجار زۆرت دەوێ. . . ســبەی شــەو، شــتێ لەشــازادە ئــالیس دەبــەم و دووری دەخەمــەوە بەڵــام تــۆ ناتوانی بیگەڕێنیتەوە»

شـەوی پاشـتر هـەموو خزمـەتکار و بەرد ەسـتەکانی پاد شـا نزیک بە شـازاد ە ئـالیس وێسـتان. شـاژن وتـی: «هـیچ کـەس ناتوانیّ شتیّ لە منالّەکەم کـەم کاتـەوە . . .. کاتـیّ هـەوا نزیـک رۆژبوونەوە بوو شاژن قیـژە و هەرایـەکی چکۆلـەی بیسـت و شتێکی دی کە منالێکی چکۆلە د ەبا. ئەو وەکـوو بالّـند ەیەکی سـووری چکۆلانـە وابـوو و چـووە سـەریّ و سـەریّ و بـە پەنجێرەکـەدا چـووە د ەریّ . رۆیشـتبوو . منالّـەکە چوبـووە خەو .

C. شاژن پەرییەکی شینی چکۆلانەی لە بەر پەنجێرەکـەدا د ی کە د انیشتبوو.

شاژن وتـی: «چت هەڵگرتووە؟»

بەڵام پەرییە شینە چکۆلانەکە د وور کەوتەوە. شازاد ە ئـالیس گەورە بوو و ژنێکی یـەکجار جـوانی لـیّ د ەرهـات بەڵـام زۆر سارد و سڕ بوو کەس خۆشی نەد ەویست. نـە شـاد بـوو نـە ناڕەحـەت و پەشـێو. کەسـی خـۆش نەد ەویسـت و کەسـیش ئەوی خۆش نەد ەویست. لە گەڵ هیچ کەس روو خۆش نەبوو. هیچ د ۆست و رفێقیشی نەبوو.

D. ئێستا لـە ولـاتێکی تـر شـازاد ەییّ (مـیریّ) بـوو بـە نێـوی شـازاد ە پیتێـر. شـازاد ە پیتێـر زۆر جـوان و بـاش بـوو زۆر د ڵسۆز و رووخۆشیش بوو هەموو کەسیّ خۆشی د ەویسـت. لـەو ولـاتە گرد ێکـی گـەورەی لێبـوو. لـە سـەر چـڵ و نـووکی گرد ەکە ماڵێکی چکۆلانـەی لێبوو. لـەو ماڵـەدا جاد ووگـەریّ

PDF 4 KURD

دەژیا. شا و شاژن لەو جادووگەرە زۆر دەترسان بەڵام شازادە (پیتێر) لێی نەدەترسا و دۆستی جادووگەرەکە بوو.


وێنە

E. شازادە پیتێر زۆر جاران بەرەو ماڵی جادووگەرەکە دەچوو. جادووگەرەکە کتێبێکی یەکجار زۆری هەبوو و کتێبێکی لێبوو کە شازادە پیتێر حەزی دەکرد چاوی لێ بکا. لە وکتێبەدا کۆمەڵێ وێنەی پیاوان و ژنانی تیا بوو... ئەو وێنانە دەجووڵانەوە. وا دەهاتنە بەر چاو کە زیندوو بن رۆژیک شازادە پیتێر چاوی لە وێنەکانی کتێبەکەی جادووگەرە کرد و وێنەی شازادەیەکی جوانی دی.

F. شازادە پیتێر بە جادووگەرەکەی وت: ئەو شازادەیە کێیە؟ جادووگەرەکە وتی: نێوی ئەو شازادەیەت پێ ناڵێم. شازادەیەکی باش نییە و بەختەورەرت ناکا.
بەڵام شازادە پیتێر ویستی شازادەکە ببینێ. ئاخر جادووگەرەکە وتی: ئەوە شازادە ئالیسە. پاشان شازادە پیتێر بۆ لای باوکی چوو و وتی: «دەچم و شازادە ئالیس دەبینم.»

G. بەو شێوەیە جلوبەرگی پیاوێکی هەژاری لە بەر کرد و چوو بۆ ماڵێ کە شازادە ئالیس لە گەڵ باوکی دەژیان. شازادە ئالیس لە نێو باخەکەدا بوو و شازادە پیتێر چاوی لە

PDF 4 KURD

شازادە کرد. ئەو لە گەڵ کەس بە رووخۆشی قسەی نەدەکرد و بەختەوەر و شاد نەبوو و خەمناکیش نەبوو و سارد و سڕ بوو. شازادە پیتێر گەڕایەوە بۆ ماڵی جادووگەرەکە. لە سەر تەپەکە وتی: «پێم بڵێ بۆچی ئەو شازادەیە ئەوندە ناڕەحەتە بۆ چی کەسی خۆش ناوێ؟ بۆچی رووخۆش نییە؟»

H. جادووگەرەکە وتی: «کاتێ منداڵێکی چکۆلانە بوو پەرییەک هات و دڵی شازادەی دوور خستەوە ... ئێستا بێ دڵە لە بەر ئەوەیە کە کەسی خۆش ناوێ.»




شازادە وتی: «دڵەکەی لە کوێیە؟»

جادووگەرەکە وتی: «تۆ دەبێ بە رۆژانێکی زۆر بگەڕێی (سەفەر بکەی) و بچیە ژوور گردە شینەکان و دەریایەکی شین تۆ دەچیە ماڵێکی شین نزیک بە چۆمی لە دەرەوەی ماڵەکە مارێکی شینی گەورەی لێیە و دەبێ بۆ سێ ساڵ کار بۆ ئەو مارە بکەی. پاش سێ ساڵەکە مارەکە درگای ماڵەکە دەکاتەوە و دەتوانی بچیتە نێویەوە و نابێ لە ماڵەکەدا لە گەڵ کەس قسەی بکەی و دڵی شازادە ئالیس لەو ماڵە دایە.



PDF 4 KURD

**I.** ئەمجارە شازادە پیتێر بۆ چەندین ڕۆژ سەفەری کرد و بەرەو دەریایەکی شینی گەورە هات، چووە سەرووی دەریا شینەکە و بەرەو گردە شینەکان هات و بەرەو ماڵێ نزیک بە چۆم هات. لە پاڵ ماڵەکەدا مارێکی گەورەی لێبوو. بە مارەکەی وت: بۆ سێ ساڵ کارت بۆ دەکەم و پاشان تۆ درگای ماڵەکە دەکەیەوە» شازادە پیتێر بۆ ماوەی سێ ساڵ کاری کرد، هەموو ڕۆژێ کار ی بۆ مارەکە دەکرد و بە کەسی نەدەوت. پاش سێ ساڵ شازادە پیتێر چاوی بە رابردوویا گێڕا. پاشان بە مارەکەی وت: «سێ ساڵەکە تەواوە؟» مارەکە وتی: «پاش سێ ڕۆژی تر، سێ ساڵەکە تەواو دەبێ» ئەمجار دوای سێ ڕۆژەکە مار، درگای ماڵەکەی کردەوە و شازادە پیتێر چووە ژوورێ.

**J.** کاتێ شازادە پیتێر چووە نێو ماڵەکە، شاژنێکی شۆخ و جوان بۆ لای هات و پێی وت: «من شاژنی ئەم وڵاتەم. تۆ کێی؟» بەڵام شازادە پیتێر قسەی لە گەڵ نەکرد. وتی: «وەرە، دەتەوێ بخۆی؟» شازادە پیتێر قسەی لەگەڵ نەکرد و نەیخوارد. پاشان شاژن زۆر توڕە بوو و دوور کەوتەوە.

PDF 4 KURD



**K.** شازادە پیتێر چووە نێو چەندین دیو و لە ئاخردا بەرەو درگایەکی گەورەی ئاسنین هات. درگاکەی کردەوە و چووە نێو دیوەکە. دیوەکە زۆر سارد بوو. میزێکی لێبوو. لە سەر میزەکە سنووقێکی زێڕینی لێبوو و نزیک سنووقەکە کلیلێکیشی لێبوو. شازادە پیتێر کلیلەکەی هەڵگرت و سنووقەکەی کردەوە لە نێو سنووقەکەدا دڵێکی چکۆڵەی تیا بوو. ئەوە دڵی شازادە ئالیس بوو.

ئەمجار شازادە پیتێر سنووقە زێڕینەکەی هەڵگرت و بۆ چەن رۆژێ سەفەری کرد لەم بەر بۆ ئەو بەری گردە شینەکان. بەرەو دەریای شین هات و چووە سەرووی دەریا شینەکە و بەرەو شاری پادشا کە باوکی شازادە ئالیس بوو، هات.

**L.** خەڵکانێکی زۆر لە سەر شەقام بوون . پرسی: بۆچی خەڵکێکی هێندە زۆر لە شەقامن؟



PDF 4 KURD

پیاوێ وتی: ئەوڕۆکە شازادە ئالیس بە شوو دەدرێ. پادشایەکی ناحەزی پیر مارەی دەکا. شازادە ئالیس زۆر سارد و سڕە، رووی خۆش لە کەس نانێ، پێم وانیە کە شاد و خۆشحاڵ بێ، بەڵام پیرە و ئەو دەبێ شوو بە کەسێ بکا.
شازادە پیتێر چوو بۆ ماڵی پادشا و بە بەردەستەکانی وت: دەمەوێ بچمە نێو ماڵی پادشا، شتێکم بۆ شازادە ئالیس هێناوە و پێی دەدەم.
خزمەتکارەکان وتیان: تۆ پیاوێکی هەژاری و ناتوانی بچیە ژوورەوە، چونکو جلوبەرگی پیاوێکی هەژارت لە بەردایە.
M. شازادە پیتێر نزیک بە درگاکە دانیشت. پاشا هاتە دەرێ. شازادە ئالیسیشی لە گەڵ بوو. شازادە ئالیس پێوە بوو مارە کرێ. پاشان شازادە پیتێر دەستی گرت و وتی ئەی شازادە شتێکم بۆ هێناوی، بیگرە.
ئەو سنووقە زێڕینەکەی کردەوە دڵێکی چکۆلەی تیا هێنایە دەر. شازادە ئالیس چاوی لە شازادە پیتێر کرد و وتی: شوو بەم پیاوە دەکەم .. ئەم پیاوەم خۆش دەوێ چونکو دڵمی بۆ هێناوەتەوە.
بەو شێوەیە شازادە پیتێر، شازادە ئالیسی مارە کرد و یەکجار زۆری یەکتریان خۆش ویست.

PDF 4 KURD

## عەلی و تووتییەکە




**A.** کوڕێ بوو بە نێوی عەلی. ئەو بۆ باڵندەکان زۆر باش بوو. رۆژێ بە رێگاڕەوی چووە دەرێ لە کێڵگەکە. نزیک بە دارێ باڵندەیەکی دی، تا ئەو کاتە نەیدیبوو. باڵندەکە سوور و شین و زەرد بوو. تووتیەک بوو کە نەیدەتوانی هەڵێ، چەند کەسێ تەقەیان لێکردبوو. عەلی باڵندەکەی گرت و بردیەوە بۆ چارداخەکەی، دانو ئاوی پێدا تا بیخوا، پاش چەند رۆژێ باڵندەکە وتی: دەڕۆم.

عەلی وتی: مەگەر دەتوانی قسە بکەی؟

باڵندەکە وتی: بەڵێ، دەتوانم قسە بکەم، تووتیەکم و دەتوانم بە ئینگلیسی قسە بکەم. من تووتییەکی شێوە پەریم. تۆ بۆ من زۆر باش بووی . . تۆ دەبێ بە ئینگلیسی لە گەڵم قسە بکەی.

PDF 4 KURD

**B.** پاشان باڵندەکە لە سەر دەستی عەلی هەڵنیشت و چووە نێو دارستانەکە و وتی: نزیک ئەم دارە دانیشە ... دەچیە خەو ....

عەلی نزیک دارەکە دانیشت و چووە خەو. پاش ماوەیەکی کەم چاوەکانی هەڵێنا. باڵندەکە ڕۆیشتبوو. عەلی تێگەیشت کە دەتوانێ جوان ئینگلیسی قسە بکا. گەڕایەوە بۆ ماڵێ.

باوکی وتی: عەلی! ئینگلیسی بە جوانی قسە دەکەی؟ کێ بەو جۆرە فێری کردووی؟

عەلی وتی: باڵندەیەکم لە دارستانەکەدا دیتەوە .. چەن کەسێ تەقەیان لێکردبوو ...من بۆ باڵندەکە باش بووم و ئەویش کاتێ کە چوومە خەو، فێرە ئینگلیسی کردم ....

عەلی چوو بۆ خوێندنگا. مامۆستاکەی وتی: عەلی ئینگلیسی جوان قسە دەکەی؟ دەمەوێ هەموو منالەکان وەکوو تۆ قسە بکەن.

**C.** عەلی برایەکی بوو بە نێوی عەبدول. ئەو زۆر ناجسن بوو. عەبدول وتی: دەمەوێ وەکوو عەلی ئینگلیسی قسە بکەم. ئەو باڵندەیە پەیدا دەکەم.



بەو شێوەیە عەبدول تفەنگێکی هەڵگرت و چووە نێو دارستانەکە و زۆر ڕۆیشت. پاشان باڵندەیەکی سوور و شین و زەردی دی کە لە سەر دارەکە هەڵنیشتبوو. تەقەی لە باڵندەکە کرد و باڵندەکە هاتە خوارێ.

ئەو وتی:تۆ برای عەلیت؟ چیت دەوێ؟

عەبدول وتی: دەمەوێ بە ئینگلیسی قسە بکەم ... وەکوو ئەو دەیکا.

باڵندەکەش وتی: نزیک ئەم دارە دانیشە دوایە دەچیە خەو وات لێدەکەم وەکوو من قسە بکەی.

پاشان عەبدول نزیک دارەکە دانیشت. چووە خەو. پاش ماوەیەک چاوەکانی کردەوە ... باڵندەکە ڕۆیشتبوو.

عەبدول چۆوە بۆ ماڵ.




**D.** عەلی و عەبدول چوون بۆ خوێندنگا و مامۆستاکە بە عەبدولی وت: دەتوانی وەکوو براکەت ئینگلیسی قسە بکەی؟

PDF 4 KURD

عەبدول وتی: بەڵێ . . . دەتوانم

مامۆستاکە وتی: گوێ دەدەمێ . . .  قسە بکە.

عەبدول دەستی کرد  بە قسە کردن. دەنگی وەک تووتیەکی ترساوی لێ هاتبوو. ئەوە، ئینگلیسی نەبوو، تەنیا قیژەیەک بوو. قیژە و هەرایەکی زۆر ناخۆش.

تووتیەکە پێی نەوت: وات لێدەکەم بە ئینگلیسی قسە بکەی. وتی وات لێدەکەم وەکوو من قسە بکەی چونکو عەبدول کورێکی ناجسن و هار بوو. هەموو مناڵانی تر لە خوێندنگاکەدا چوونە نێو دارستانەکە تا باڵندەکە پەیدا کەن. بەڵام قەت نەیاندیتەوە. ئەو دوور کەوتبۆوە.

PDF 4 KURD

# شازادەی شاراوە



A. رۆژگارێ، شازادەیەک بە نێوی ئان بوو، شازادە حەزی لە خۆشاروەکێنە دەکرد، خۆی لە باخدا دەشاردەوە و دۆستەکانی دەهاتن و دەیاندۆزییەوە. ئەمجار دۆستەکانی خۆیان دەشاردەوە و ئەو دەیانیدۆزیەوە. خۆشاردنەوە و دۆزرانەوەی، زۆر پی خۆش بوو. شازادە گەورە بوو. پادشا ،باوکی،وتی: دەبێ شوو بکەی... دەتەوێ شوو بە کام شازادە بکەی؟!

شازادە وتی: دەمەوێ شوو بکەم بە شازادەیەک کە خۆشاروەکێنەی پێ خۆش بێ و کاتێ خۆم دەشارمەوە، بمدۆزێتەوە...

پاشان پادشا وتی: شازادە شوو دەکا بە شازادەیەک کە بتوانێ بیدۆزێتەوە کاتێ خۆی دەشارێتەوە ..

PDF 4 KURD

زۆر شازادە دەهاتن . . . هەر ڕۆژ دەورو بەری شەش تا حەوت شازادە دەهاتن و شازادە خۆی دەشاردەوە و هەموو شوێنێ لە شازادە دەگەڕان . . . لە گشت دیوەکانی ماڵەوە . . لە هەموو باخ و چارداخەکان، بەڵام هیچ یەک لە شازادەکان پەیدایان نەدەکرد .

**B.** (میرێ ) شازادەیێ بوو بە نێوی جان (John). شازادەیەکی زۆر هەژار بوو حەزی لە شازادە ئان دەکرد . شازادە ئانیش، شازادە جانی خۆش دەویست. شازادە جان لە گەڵ شازادەکانی تر هاتن تا بۆ شازادە ئان بگەڕێن بەڵام نەیتوانی بیدۆزێتەوە. زۆر ناڕەحەت بوو و ڕۆیشت لە لایەکی ڕێگاکە دانیشت. پیرێژنێ بە ڕێگاکەدا دەهاتە پێش. پیرێژنەکە وتی: «کێی؟ . . بۆچی لە قەراغ ڕێگاکەدا دانیشتووی؟ . . . بۆچی ناڕەحەتی؟»

شازادە جان وتی: «لەبەر ئەوە ناڕەحەتم کە نەمتوانی شازادە ئان ببینمەوە . . . من ویستم شازادە ئان بێنم»

پیرێژنەکە وتی: «دیسان بگەڕێوە و لە شازادە بگەڕێ . . . چەن شازادە لە گەڵ تۆدا هاتن و لە شازادە گەڕان؟»

شازادە جان وتی: «شەش شازادەی تر . . . منیشیان لە گەڵ بووم کە بۆ شازادە ئان گەڕاین»

پیرێژنەکە پرسی: «حەوت شازادە بوون کە لە شازادە ئان دەگەڕان؟ . . . ئایا زیاتر لە حەوت شازادە بوون کە بە دوایدا دەگەڕان؟ . . . ئەوەم لە تۆ پرسی؟»

شازادە جان وتی:«نازانم . . . شەش شازادە لە گەڵما هاتن تا بۆ شازادە بگەڕێین»



C. شازادە جان گەڕایەوە. حەوت شازادە بوون کە لەو ڕۆژەدا بە دوای شازادەدا دەگەڕان. شازادە جان و شەشی تر. ئەوان چوونە نێو هاڵە گەورەکە. پادشا وتی: «شازادە خۆی شاردۆتەوە . . . ئێوە ئێستا دەتوانن بچن و لێی بگەڕێن»

هەموو شازادەکان دەستیان پێ کرد و هەموو جێیەک لە شازادە ئان گەڕان. لە هەمو دیوەکانی ماڵێدا. لە هەموو ماڵە دارینەکاندا . .. لە هەموو باخەکاندا . .. بەڵام هیچ یەک لە شازادەکان نەیاندییەوە. شازادە جان چاوی لە شازادەکان کرد . هەشت شازادەی چاو پێکەوت.

وتی: «شەش شازادە لە گەڵمدا هاتن . . . حەوت شازادەی لێبوو . . . بەڵام ئێستا هەشت شازادەی لێیە» چاوی لە

PDF 4 KURD

شـازادەکەی تـر کـرد، بەڵـام ئـەو دەموچـاوی شـاردەوە. شازادەکانی تر خەریکی گەڕان بە دوای شازادەدا لە هـەموو دیوەکـان و باخـەکان و ماڵـە دارینەکانـدا بـوون. بەڵـام دەموچاوی پیشان نەدا.

**D**. پاشان هەموو شـازادەکان بـۆ لای پادشـا هـاتن و یـەکیان وتی: «ئەی پادشا! ناتوانین شازادە بدۆزینەوە»

ئـەوی تـریش هـەر وای وت. هـەموو شـازادەکان وتیـان: «نـاتوانین شـازادە ئـان پەیـدا کـەین» شـازادە جـان وتی: «شەش شازادە لە گەڵمدا هـاتن و منـیش هـاتم. بـەو شـێوەیە حـەوت شـازادەی لێبـوو کـە لـە شـازادە دەگـەڕان ... بەڵـام ئێستا هەشـتی لێیـە ... شـازادەم دۆزییـەوە ... ئـەو لـە گـەڵ ئێمەیـە ... ئـەو لێرەیـە ... ئـەو جـلوبـەرگی شـازادەی لـە بـــەردایە و لـە گەڵـمانا هـات تـا بـە دوای شـازادە ئـان دا بگەڕێ ..»

پاشان شازادە ئان زۆر خۆشحاڵ بوو، ویستی شـوو بکـا بـە شازادە جان. بەو شێوەیە شووی کرد بە شازادە جان و زۆر خۆشحاڵ بوون و منداڵێکی زۆریان بوو. مناڵەکان حـەزیان لـە خۆشـارووکێنە لـە نێـو باخـدا دەکـرد و شـازادە جـان و شازادە ئـان دەهـاتن و بـە دوایانـدا دەگـەڕان و هـەموویان زۆر خۆشحاڵ بوون.

PDF 4 KURD

## نانی کڵۆڵی




**A.** نانەوا پیاوێکە کە نان دەکا. ڕۆژگاریێ نانەوایێ بوو، پیاوێکی باش نەبوو. وەختێ کە نانەکەی باش نەدەبوو ڕقی هەڵدەستا، نانەکەی لە پەنجێرەکەوە دەخستە دەرێ. ژن و منالەکانی نیگەران بوون. ڕۆژێک نانی نانەواکە زۆر خراپ بوو. نانەواکەش زۆر تووڕە. ماوەیەک دوایی پەرییەکی چکۆلانە هاتە نێو دیوەکە. پەرییەکە وتی: «دەمەوێ لە تەنوورەکەتدا بمێنمەوە کە نانی تیا دەکەی . . . ئەگەر لە نێو تەنوورەکەتدا بمێنمەوە نانەکەت هەمیشە باش دەبێ. . . بەڵام نابێ خۆت لێی بخۆی»

**B.** نانەواکە وتی: «بۆچی دەبێ لە نانەکە نەخۆم؟»

پەرییەکە وتی: «چونکو نانی کلۆڵی و بەدبەختییە و نانێکی چاکە و ژنان دەیکڕن بەڵام هەرکەس نانەکە بخوا کلۆڵ دەبێ..

«یانی نانەکەم هەموو کەسێ کلۆڵ و بەدبەخت و رۆژەڕەش دەکا...»

پاشان پەرییەکە چووە نێو تەنوورەکە. نانەواکە بڕێ نانی کرد و نانەکەی جوان بوو. کاتێ نانەکە ئامادە بوو چووە دەرێ و نانەکەی بردە نێو داشقەکە و بۆ ماڵان.



c. کاک ئای پێڵاو سازێ بوو. خانمی ئای بڕێ لە نانی نانەواکەی کڕی. نانەکەی لە سەر میزەکە دانا. کاک ئای هاتە نێو دیوەکە تا بیخوا. کاک ئای وتی: «زۆر بەختەوەرم... ئەمرۆکە کەوشی چاکم دروست کردوون و خەڵکانێکی زۆریش کەوشەکانم دەکڕن»

پاشان بڕێ لە نانەکەی خوارد، نانەکە کلۆڵی کرد.

PDF 4 KURD

«. . . نا . . . نا . . . من بەختەوەر نیم . . . کەوشەکانم باش نین . . . زۆر خراپن . . . ژن و منالەکانم باش نین . . . ئەم ماڵە باش نییە . .. زۆر کلۆلم»

**D**. کاک بی، ماسیگرێ بوو. دادە بی، برێ لە نانی نانەواکەی کڕی و لە سەر میزەکەی دانا. کاک بی هاتە نێو دیوەکە تا بیخوا. دانیشت و وتی: ها . . . ها . . . زۆر بەختەوەرم . . چونکو ماسییەکی گەورەم گرتووە . . .زۆر ماسی گەورەی تریش لە نێو چۆمەکەدا هەیە . .. ژن و کوڕێکی باشم هەیە و زۆریش بەختەوەرم» ئەمجار برێ لە نانەکەی خوارد و وتی: «نا . . نا . . ژنەکەم خراپە . . کوڕەکەشم هەر خراپە . . . کەس ماسییەکەم ناکڕێ . . .چۆمەکە ماسی گەورەی زۆری تیا نییە و زۆر کلۆلم»

**E**. کاک سی جل وبەرگی بۆ خەڵک دەدووری. ئەویش برێ لە نانەکەی کڕی و هاتە نێو دیوەکە تا بیخوا. وتی: زۆر بەختەوەرم چونکو کەوایەکی جوانم دووریوە . .. پادشا داوای لێ کردووم تا کۆتێکی بۆ بدوورم و ئێستا ئامادەیە . .. کۆتێکی جوانە . . . چەندین گوڵم لە سەر دووریوە و گەلێ جوانە . .. ژنێکی جوان و دوو کچی شۆخ و شەنگم هەیە و ماڵ و باخێکی جوانیش . .. من زۆر بەختەوەرم» پاشان برێ لە نانەکەی خوارد و وتی: «پادشا لێی ویستووم کۆتێکی بۆ بدوورم . . . کۆتێکم دووریوە و خراپە . . .پادشا تووڕە دەبێ . . . دەمکوژێ . . . ژنەکەم جوان بوو، ئێستا ناحەزە،

دوو کچم هەیە جوان نین، کەس نایانخوازێ، خانووەکەم ناحەزە، باخەکەشم هەر وا. . . زۆر کڵۆڵم»

**F.** کاک ئای، کاک بی و کاک سی نانەواکەیان دی کە بە شەقامدا دەڕوا و زۆر خۆشحاڵە، چونکو هەموو نانەکەی فرۆشتبوو و هیچ یەک لە نانەکەی نەخواردبوو، لە بەر ئەوە خۆشحاڵ و بەکەیف بوو. بە شەقامەکەدا دەڕۆیشت و زۆر خۆشحاڵ دیار بوو. کاک ئای، کاک بی و کاک سی وتیان: هەموو کڵۆڵین، بەڵام نانەواکە بەختەوەرە . .. بۆچی خۆشحاڵە کاتێ ئێمە خۆشحاڵ نین؟ دەچینماڵەکەی دەسووتێنین»



بەو شێوەیە، کاک ئای، کاک بی و کاک سی چوون وماڵی نانەواکەیان ئاور تێبەردا. وختێ کە ماڵی نانەواکە دەسووتا پەرییەکە، تەنوورەکەی بە جێ هێشت و هەڵات.

PDF 4 KURD

**G.** هەر کە پەرییەکە هەڵات، کاک ئای، کاک بی و کاک سی دیسان خۆشحاڵ بوون و وتیان: «بۆچی وا خەریکە ماڵی نانەواکە دەسووتێنین؟ نانەواکە پیاوێکی باشە و ئێمەش پیاوی چاکین . . . هەموومان بەختەورین. بۆچی ماڵەکەیمان سووتان؟»

پاشان هەڵاتن و ئاویان هێنا و بە سەر ئاورەکەیاندا کرد و ماڵێکی تازەی جوانیان بۆ نانەواکە دروست کرد. پەرییەکە بۆ ماڵی نانەواکە نەگەڕایەوە. نانەواکە نانی کرد، برێ لە نانەکانی باش بوون و برێکیتریش خراپ. بەڵام تووڕە نەدەبوو. وتی: «نانی باشی لێیە و نانیشی لێیە کە ئەوندە باش نییە. رۆژی خۆشیش هەیە و رۆژی واش هەیە کە ئەوندە خۆش نییە، بەڵام ئەگەر ئێمە خۆشحاڵ بین، هیچ نانێ خراپ نییە و هیچ رۆژێکیش خراپ نییە»

بەو شێوەیە هەموو کەسێ لە دێیەکەدا نانی نانەواکەی دەخوارد. زۆر جار نانەکە باش دەبوو و جاری واش هەبووخراپ دەردەهات، بەڵام ئەوان هەمیشە زۆر خۆشحاڵ وبەختەوەر بوون.

PDF 4 KURD

## سیگفرێد و هاندا



A. لە نزیکی دارستانێکی گەورەدا دێیەکی چکۆلانە بوو. هەموو خەڵکی ئەو دێیە خۆشحاڵ و بە کەیف بوون و کارێکی زۆریان دەکرد. قەت نەخۆشی نەبوو. مناڵەکان هەموو گەورە و خۆشحاڵ بوون. لەو دێیەدا پێڵاوسازێ بە نێوی راڵف دەژیا. کوڕێکی بە نێوی سیگفرێد هەبوو. پیاوێکیشی لێبوو بە نێوی جان کە جلو بەرگی دەدووری. جان کچێکی چکۆلانەی بە نێوی هاندا هەبوو. سیگفرێد وتی: «وەختێ گەورە بووم هاندا دێنم» هانداش وتی: کاتێ گەورە بووم شوو بە سیگفرێد دەکەم»

B. رۆژێ پیرەپیاوێکی ناحەز بە رێگاکەدا هاتە پێش. کۆڵێ کەوشی بە پشتەوە بوو. لە دێیەکەدا دانیشت و وتی: وەرن

بکـڕن . . . وەرن بکـڕن . .. پێڵـاوەکان بـۆ هـەموو . . . کەوشـە سپییەکان . . هەموو جۆرە کەوشێ . . . »
پیاوان و ژنانی گوندەکە ناکڕن و وتیان: راڵفی پـیر کەوشـی باش دروست دەکا . . . ئێمـە کەوشـەکانی راڵـف دەکـڕین و کـەوش لـە پیرەپیـاوێکی ناحـەز ناکـڕین» کچێکـی چکۆلـەی جوانی بە نێوی لیسـبێس لێبوو. پێـی خـۆش بـوو لـە زمـانی هـەموو کەسـێکەوە ببیسـتێتەوە کـە بڵـێ: «لیسـبێس چەنـدە جوانە» لیسبێس چاوی بە کەوشـەکانی پیرەپیـاوە ناحەزەکـە کەوت، کەوشەکانی هەمو زۆر جوان بوون.
لیسـبێس وتی: «مـن جووتـێ لـەو کەوشـانە دەکـڕم» ئـەو دۆسـتێکی بـە نێـوی ئـالیس بـوو. کاتـێ ئـالیس کەوشـەکانی لیسبێسـی دی وتی: منـیش کـەوش لـەو پـیرە پیـاوە ناحـەزە دەکـڕم» بـە زوویـی هـەموو خەڵـکی نێـو دێ کەوشـیان لـە پیرەپیاوە ناحەزەکە کڕی.
C. راڵف زۆر تێکچوو. هیچ کەس کەوشـەکانی لـێ نەدەکـڕی. نەیدەزانی کە چۆن خۆی بەخێو کا. چونکو کەس کەوشی لێ نەدەکـڕی. سـیگفرێد نارەحـەت بـوو و هانـداش لـە بـەر نارەحەتی ئەو بەپەرۆش بوو.
لەمەو بەدوا شتە خراپەکان دەستیان بـە قـەومان بـۆ دێیەکـە کر. بـاران نەدەباری، زۆر لە پیاوان و ژنان نەخۆش کەوتن . . . مانگاکان لە مووچە و کێڵگەکاندا نەخۆش کەوتن . . . دار و گوڵەکان بە هۆی خـۆرەوە هەڵـپرووکان . . . خەڵـک هـەموو

PDF 4 KURD

بەد بەخت و کلۆڵ کەوتن. ڕۆژێ باوکی لیسبێس خێرا بەرەو شەقامەکە چوو وتی: «لیسبێس گوم بووە و ناتوانم بیبینمەوە»



خەڵکەکە چاویان لە هەموو ماڵان و مووچە و کێڵگە و دارستانەکە کرد. هیچ کەس نەیتوانی بیدۆزێتەوە.

D. ڕۆژی دواتر ئالیس گوم بوو. دەسبەجێ دوای ئەو کچێکی تر گوم بوو. بە زوویی هەموو کچەکانی نێودێ گوم بوون. هاندا تەنیا کچێ بوو کە لە دێیەکەدا مابۆوە. خەڵکەکە وتیان: «کچە چکۆلەکانمان لە کوێ گوم بوون؟ ... چییان بە سەر هاتووە؟ ... بۆچی هاندا گوم نەبووە؟» هاندا کەوشێکی نەبوو. راڵف و سیگفرێد هیچ کەوشێکیان نەبوو تا بیدەنێ. پاشان سیگفرێد چوو تا جووتێ کەوش بۆ هاندا بکڕێ. جووتێ کەوشی لە پیرەپیاوە چکۆلەکە کڕی،

PDF 4 KURD

کەوشەکانی کڕی و دای بە هاندا. ڕۆژی دوایی هانداش گوم بوو.

E. سیگفرێد چوو بۆ نێو دارستانەکە، وتی: «بە دوای هاندادا دەگەڕێم و دەیبینمەوە . . . ئەگەر نەیدۆزمەوە دەمرم»



لە دارستانەکەدا کەروێشکێکی دی کە لە سەر بەردێکی گەورە هەڵنیشتبوو، کەسێ تەقەی لێکرد بوو، نەیدەتوانی بڕوا. ئەمجار سیگفرێد یاریدەی کەروێشکەکەی دا. کەروێشکەکەش زۆری پێ خۆش بوو و پێی وت: «خەریکە بە دوای هاندا دا دەگەڕێی . . . ئەو لە گەڵ هەموو کچۆڵەکانی تری دێیەکە . . . »

سیگفرێد وتی: «لە کوێن؟»

ـ لە کونێکی گەورەدان . . . ناتوانن هەڵێن چونکو کەوشی پیرە پیاوێکی چکۆلەیان لە پێدایە . . ئەوانە کەوشی پەریئاسایە . . . ئەو پیرە پیاوە چکۆلە ناحەزە پەرییەکی دێز

و خراپە ...کچە چکۆلەکان دەگرێ و ئەگەر نەتوانێ بیانگرێ دەمرێ»

**F.** سیگفرێد وتی: چۆن دەتوانم هاندا بێنمەوە؟

کەروێشکەکە وتی: دەبێ گشت کەوشەکانی دێیەکە دەسخەیت و لە سەر نووکی بەردێکی گەورە دایانێی و بیانسووتێنی ...کاتێ کە هەموویان سووتان جووتێ کەوشی زێڕین لەو شوێنە کە ئاورەکە بوو دەبینی ...کەوشە زێڕینەکان لە پێ کە ...وەختێ لە پێت کردن دەبێ سێ جار بە پێت لە بەردە گەورەکە بدەی...ئەمجار بەردەکە دەقەڵەشێ ...بە نێو کونەکەدا بچۆ خوارێ ...ئەمجار هاندا دەدۆزیەوە ...کەوشە پەرییەکان لە پێت داکەنە، دوایە کچەکان لە گەڵتا دێن»



**G.** سیگفرێد وتی: چۆن دەتوانم گشت کەوشەکانی ناو دێ خڕ کەمەوە؟»

PDF 4 KURD

کەروێشکەکە وتی: رفێقەکانم، مشکەکان، یاریدەت دەدەن. پاشان هەرای کرد و مشکێکی گەورە هات. ئەو، شای مشکان بوو. کەروێشکەکە وتی: «ئەی شای مشکان! تکایە هەموو کەوشەکانی دێ هەر ئەمشەو بێنە ئێرە»

کاتێ شەو داهات سیگفرێد چووە نێو دارستانەکە و لەوێ دانیشت و چاوی بە سەدان مشک کەوت کە کەوشەکانیان لە دێیەکەوە دێنا. خێرا هەموو کەوشەکان لە دێیەکەوە هێنران، پاشان سیگفرێد کەوشەکانی لە سەر نووکی بەردێکی گەورە دانا و ئاوری تێبەردان. کاتێ کە هەموو کەوشەکان سووتان سیگفرێد چاوی لە بەردەکە کرد و جووتێ کەوشی زێرینی دی.

**H.** کەوشە زێرینەکانی لە پێ کرد بە لاق لە بەردە گەورەکەی کوتا. بەردەکە کرایەوە و کونێکی گەورەی تێکەوت. بە کونەکەدا چووە خوارێ و هاندای لەوێ دی. لە گەڵ هەموو کچۆڵەکانی تر. وا دەهاتنە بەرچاو کە لە خەودا بن. چاوەکانیان وێک نابوو. سیگفرێد کەوشەکانی هاندای داکەند. هاندا چاوەکانی هەڵێنا و هەڵبەزییەوە. ئەمجار سیگفرێد و هاندا گشت کەوشی کچۆڵەکانیان داکەند ... هەموویان هەڵبەزینەوە ... دوایە لە کونەکە هاتنە دەرێ.

**I.** سیگفرێد و کچۆڵەکان گەرانەوە نێودێ. خەڵکی نێودێ وەختێ ئەوانیان دی، زۆریان پێخۆش بوو ، سیگفرێد لەبارەی پیرەپیاوە چکۆلە ناحەزەکە پێیانی وت هەموویان

PDF 4 KURD

زۆر تووڕە بوون و تێکرا بۆ ئەو شوێنە کە پیرە پیاوە ناحەزەکەی لێبوو، هەڵاتن.

وتیان: دەیگرین.

گەیشتنە ئەو جێیە. چاوانی پیرە پیاوە چکۆلە ناحەزەکە لێکنرابوو. دیتیان کە مردووە، نەیانکوشت چونکو مردبوو. لە پاش ئەوە خەڵکی دێیەکە دیسان زۆر خۆشحاڵ بوون. باران باری... گوڵەکان دیسان گەشانەوە... منداڵەکان گەورە و خۆشحاڵ بوون و تێکڕای خەڵک کەوشەکانی راڵفیان دەکڕی.

سیگفرێد هاندای هێنا و زۆر شاد بوون، کاتێ کە راڵف پیر بوو، سیگفرێد کەوشی بۆ هەموو خەڵکی نێو دێ دروست دەکرد.



PDF 4 KURD

## دێی تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕین

**تەونە (تاڵە) جاڵجاڵووکە**



A. ئەوە جاڵجاڵووکەیەکە و تاڵی جاڵجاڵووکە. دێیەک بە نێوی ئارا لە سەر تەپێ بوو بەڵام پیاوان نێویان نا: دێی تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕین. چونکو ژنەکانی ئەو شوێنە پارچەی جوانیان دروست دەکرد. پارچە بە رادەیەک جوان بوو کە وەکوو




تاڵێکی جاڵجاڵووکەی زێڕین وابوو. لەو وڵاتەدا پیاوان دەیانوت: دەبێ لە شەوی بەر لە ساڵی نوێ درگا داخەی و نابێ بێڵێ ئاورەکە بکوژێتەوە.

ئەگەر درگاکە کراوەتەوە و ئاورەکە لا حاڵی دایساندا نییە، پێرکتا و سەگەکەی دێنە ژووری و تووڕە دەبێ و شتە

PDF 4 KURD

خراپەکان دەقەومن. پێرکتا پەرییەک بوو لە شەوی بەر لە ساڵی نوێدا دەردەکەوت و سەگێکی سپی هەبوو.
**B.** کچێکی بە نێوی فلۆریس لێبوو کە لەو دێیەدا دەژیا. دایکی پارچەی جوانی دەکرد، بەڵام ژنان پارچەیان لێ نەدەکڕی. ئەوان نەیاندەویست پارچەی باش بکڕن.. پارچەی خراپیان دەویست. دایکی فلۆریس وتی:
ژنان ئێستا پارچەی باشیان ناوێ و پارچەکانم لێ ناکڕن. ئیتر پارچە دروست ناکەم... فلۆریس! پێت ناڵێم کە چۆن پارچەی زیاتر دروست کەین.
دایکی فلۆریس مرد و پێی نەوت کە چۆن پارچە دروست کەن و هیچ تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕینی تری لێنەمابوو. کەس نەیدەزانی کە چۆنی دروست بکەن. لەو دێیە پیاوێکی بە نێوی فیلیپ لێبوو. ئەو، فلۆریسی خۆش دەویست، بەڵام زۆر دەسکورت و هەژار بوو. فیلیپ و فلۆریس لە بەر ئەوە نەیاندەتوانی ببنە هاوسەری یەکتر.
**C.** پادشای ئەو وڵاتە لە گەشت و گەڕاندا بوو. چاوی بە دێی تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕین کەوت و بە یەکێ لە پیاوەکانی خۆی وت: ئەو دێیە چییە؟
پیاوەکە وتی: ئەوە دێی تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕینە.
پادشا وتی: بۆچی وای پێدەڵێن؟

PDF 4 KURD

پیاوەکە وتی: چونکو ژنانی دێیەکە پارچەی جوانی لێ دروست دەکەن . . . پارچەکە لە زێڕ دروست دەکرێ و وەکوو تەونێکی جاڵجاڵووکە وایە.

پادشا وتی: برێ لەو پارچەم دەوێ.

پیاوەکە بە هەموو ماڵاندا گەڕا و وتی: پادشا برێ تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕینی دەوێ.

بەڵام ژنان وتیان: ئێستا پارچەی زێڕینی لێ نییە و نازانین چۆنی دروست کەین.

پاشان پادشا وتی: پارەیەکی زۆر دەدەم بەو کەسەی کە برێ لە پارچە زێڕینەکەم بۆ بێنێ . . . ئەگەریش بۆم نەهێنن تورە دەبم. . . چونکو تەمبەڵ و لەشگرانن.

**D.** فلۆریس پشیلەیەک و دوو مریشک و باڵندەیەکی هەبوو.


ڕەشمەڵ

باڵندەکە ڕەشمەڵ بوو. کات و سات، شەوی پێش ساڵی تازە بوو. پشیلەکە خەوتبوو. پاشان چاوەکانی هەڵێنا و وتی: هۆی . . . خەریکە ئاورەکە دەکوژێتەوە.

پاشان هەرای کرد: ڕەشمەڵ!

ڕەشمەڵ وتی: چیت دەوێ؟

پشیلەکە وتی: خەریکە ئاورەکە دەکوژێتەوە . . . برۆ دار بێنە و بە مریشکەکان بڵێ بێن .

بەو شێوەیە رەشمەل چوو دار بێنێ و هەرا لە مریشکەکان بکا. پاشان درگاکە کرایەوە و دوو مریشکەکە هاتنە ژووریَ.
وتیان: چیت دەویَ؟
پشیلەک وتی: ئاورەکە خەریکە دەکوژێتەوە ...لە پێشیەوە راوەستن و داری تێخەن تا بسووتیَ.
بەو شێوەیە دوو مریشکە لە پێشەوەی ئاورەکە وێستان و داریان تێخست تا بسووتیَ.
E. وەختیَ ئاورەکە چاک دەسووتا، پشیلەکە وتی: ئێمە زۆر فەقیرین ...چی دەکەین؟
رەشمەل وتی: پادشا تاڵە جاڵجاڵووکەی زێرینی دەویَ و پارەیەکی زۆری بۆ دەدا. من دەمەویَ تەونی جاڵجاڵووکەی زێرین دروست کەم بەڵام نازانم چۆنی دروست کەم؟
پشیلەکە وتی: تۆ پیاوێکی و ناتوانی تەونە جاڵجاڵووکەی بەو دەستانەت دروست کەی...من ژنێکم و دەمتوانی تەونی جاڵجاڵووکەی زێرین بکەم ..بەڵام کارێکی یەکجار زۆرم هەیە.
رەشمەل وتی: فیلیپ دەیەویَ فلۆریس بێنێ بەڵام ناتوانن ببنە هاوسەر چونکو دەسکورتن
پاشان مریشکیَ وتی: فەقیرم و شووم نەکردووە ...ئێمە دوو خوشکین و کەس نامانخوازیَ.

F. پاشان درگای ماڵەکە کرایەوە و سەگە سپییەکە هاتە ژووریَ و پشیلەکە هەڵبەزییەوە سەر میزەکە. رەشمەل چووە سەر پەنجێرەکە، دوو مریشکەکەش هەڵاتن.

پشیلەکە وتی: ئێمە نەمانهێشتووە ئاورەکە بکوژێتەوە، بەڵام لەبیرم چوو درگاکە داخەین، بە پێرکتا بڵێ زۆر هەژار و فەقیرین.

سەگەکە پرسی: بۆچی فەقیرن؟

پشیلەکە دەڵێ: فەقیرین، چونکو ژنان پارچەی زێڕین ناکڕن و دایکی فلۆریس فێری نەکردووە کە زیاتری لێ دروس کەن



. . . ئێستا پادشا پارچەی زێڕینی دەوێ و کەسیش ناتوانێ بیکا.

**G.** سەگەکە چوو بۆ لای پێرکتا و وتی: دەرگاکەی ماڵی فلۆریس کرابۆوە . . . تکایە تووڕە مەبە، پشیلە و ڕەشمەل و دوو مریشکەکە ئاورەکەیان ڕاگرتووە . . . لە بەر ئەوە تووڕە مەبە . . ئەوان دەڵێن کە فەقیر و هەژارن . . . . چون دایکی فلۆریس مرد و پێی نەوتووە چۆن پارچەی زێڕین دروست کا.

پێرکتا وتی: «ئەها! من دایکی فلۆریس بانگ دەکەم» ئەمجار بە سەگە سپییە چکۆلانەکەی وت: «بڕۆ لە سەر جێگاکەی فلۆریس دا هەڵبەزەوە »

فلۆریس خەوتبوو. شتێ لە سەر جێگاکەی هەڵدەبەزیتەوە، هەستا هەرایەکی چکۆلانەی لە دیوەکەی تردا بیست. دایکی لەوێ دی. دایکی کە مرد بوو گەڕابۆوە و کاری دەکرد . خەریکی دروست کردنی تەونی جاڵجاڵووکەی زێڕین بوو. فلۆریس چوو لە پاڵیا دانیشت . . . دیتی کە چۆن دایکی پارچەی زێڕین دروست دەکا دایکی ئەو شەوە بە تەواوەتی کاری کرد . پاشان ڕۆژ هات و دایکی لەبەر چاو گوم بووەوە.

**H.** پاشان فلۆریس دانیشت و تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕینی کرد . پیاوانی پادشا هاتن و پارەکەیەکی زۆریان دا بە فلۆریس بۆ پارچە زێڕینەکەی کە کرد بووی. پێیان وت بڕێ زۆرتر لە تەونی جاڵجاڵووکەی زێڕین بۆ پادشا دروست

بکا. بەو شێوەیە فلۆریس دانیشت تا تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕین بکا. فیلیپ هاتە نێو باخەکە و وتی: فلۆریس! ساڵێکی تازەی خۆش چاوەڕێت بێ!

فلۆریس وتی: ساڵی نوێی تۆش پیرۆز بێ، فیلیپ! ئەمساڵم زۆر خۆش دەوێ چونکو دەتوانین ئێستا ببینە هاوسەری یەکتر.

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

## شازادەی لەیستۆکی




**A**. ئەم شتانە هی کایــەن. منداڵــان شـــــــتومەکی کایـەیان خـۆش دەوێ. تــــۆش شـتومەکی کایــە لـــە دووکـــــان دەکــــڕی. ئەمـــە دووکـــــــانێکی شـــــــتومەکی کایەیە. منداڵان لە گەڵ شتومەکی کایە یاری دەکەن. ئەم منداڵـانە خەریکی کایە کردنن.

**B**. رۆژگـــارێ پادشـــایەکی بــاش بـــوو. ژنێکـــی مـــارە کـــرد . شاژنەکە زۆر بەختەوەر بوو. شاژنەکە دۆستێکی شـێوەپەری بە نێوی تابورێت بــوو. تابورێــت شــاژنی خـۆشدەویسـت. شاژنەکە حەزی دەکرد کایە بکا و قسە بکا، هەرا و قیژە ساز کا. کاتێ کە شاژن کایــە و هــەراوقیژەی ســاز دەکرد دەیــوت: «تۆ شاژنێکی، نابێ قیژەوهەرا ســاز بکــەی» پــاش ماوەیــەک شاژن شازادەیەکی چکۆلــەی بــە نێــوی ئۆرسـۆلا بــوو. کاتــێ ئۆرســۆلا بــۆ لای شــاژن هــات، مردبــوو. شــازادە ئۆرســۆلا

PDF 4 KURD

گەورە بوو لە دایکی دەچوو. حەزی دەکرد کایە بکا، قسە بکا و هەراوقیژە ساز بکا. بەڵام وەختێ کە شازادە ئۆرسۆلا کایەی دەکرد، پادشا توورە دەبوو و دەیوت: «هەرا و قیژە ساز مەکە . . . دەبێ شازادەیەکی چکۆلەی باش بی . . . »

C. شازادە هیچ شتومەکی کایەی نەبوو، کایەی نەدەکرد، چونکو باوکی توورە دەبوو. قسەی نەدەکرد چونکو باوکی پێی وتبوو کاتێ قسەت لە گەڵ دەکرێ قسە بکە. بەم شێوەیە ئۆرسۆلا تەنیا دەیوت: « بەڵێ . . . نا . . . تکایە . . . سپاست و وایە» شازادە زۆر پەرێشان بوو. وتی: «ناتوانم قسە بکەم . . کایە بکەم . . . هەراوشلووقی بکەم . . . دەڵێن تۆ شازادەی . . . . ئەوە مەکە . . ئەوە بکە . . . نابێ هیچ شتێ بکەم». تابورێت بۆ لای شازادە هات تا بیبینێ. چاوی بە شازادە کەوت و زۆر نارەحەت بوو. پادشای دی کە ئەو دەمەی شازادە قسە یان کایەی بکردایە یان هەر شتێکی بکردایە لێی نارەحەت دەبوو.

D. پاشان تابورێت بەرەو دووکانێکی گەورەی شتومەکی کایە بەرێ کەوت. ئەمە دووکانێکی شتومەکی کایە لە وڵاتی پەرییەکاندا بوو. لەم دووکانەدا شتومەکی کایەی پەریئاسا دروست دەکرا. پیاوەکە لە دووکانەکەدا وتی: «چیت دەوێ؟» تابورێت وتی: «شازادەیەکم وەکوو ئەمە دەوێ» پیاوەکە وتی: «بەڵێ . . . بەڵێ، گەلێ شتومەکی کایەی شازادەکانم لەم دووکانەدا هەیە . . . بەڵام هیچ شازادەیەکم

دروست وەکوو ئەوە نییە . . . دەبێ دانەیەکت بۆ دروست کەم . . . شازادەیەکی وات دروست بۆ دەردێنم . . . دوای سێ رۆژی تر بگەڕێوە ئێرە . . . شازادەکە ئامادە دەبێ»




E. دوای سێ رۆژ تابورێت بۆ دووکانەکە گەڕایەوە و شازادە لەیستۆکییەکەی هەڵگرت و بەرەوماڵی پادشا چوو. تاریک داهاتبوو. شازادە لە جێیەکەیدا خەوتبوو. زۆر پەرێشان و بەخەم بوو. دەگریا. تابورێت بە نێو پەنجێرەکەدا هات. بە شازادەی وت: «دیتم کە زۆر ناڕەحەتی . . . لەگەڵما وەرە . بۆ ماڵی ماسیگرێکت دەبەم . دەتوانی هەموو رۆژێ لەوێ کایە بکەی . . . زۆر شاد و خۆشحاڵ دەبی . . . لە گەڵما دی؟» شازادەکە وتی: بەڵێ . . بەڵێ . . . لە گەڵت دێم . بەڵام ئەگەر باوکم بەجێ بێڵم ناڕەحەت دەبێ . .» تابورێت وتی: «ئەو نازانێ کە تۆ رۆیشتووی و من شازادە لەیستۆکییەکە (بووکەڵەییەکە) لە جێگاکەتدا دادەنێم»

شــازادە لەیســتۆکیەکە دروســت وەکــوو ئۆرســۆلا وابــوو. ئۆرسۆلا و تابورێت لە پەنجێرەکەوە چوونە دەرێ. چوونە ســەرووی دەریــا و ئۆرســۆلا دەژیــا لــە ماڵــە دارینەکــەی ماسیگرەکە و زۆر زۆر خۆشحاڵ بوو.

F. ئۆرســۆلا گــەورە بــوو. بــووە ژنێکــی جــوان. لەگــەڵ گــەورەبوونی ئۆرســۆلا شــازادە لەیســتۆکییەکەش گــەورە دەبوو. چونکو ئەو لەیستۆکییەکی شێوەپەری بوو. کاتێ قسەی دەکرد دەیوت: «بەڵێ ... نا .. تکایە ... سپاست و دروســت وایــە .. » قــەت هــیچ شــتێکیتــری نــەدەوت. ماسیگرەکە کورێکی بە نێوی ئۆلیڤێر بوو کە دەیویست ئۆرسۆلا بێنێ. رۆژێ تابورێت بۆ ماڵە دارینی ماسیگرەکە هات. ئۆرسۆلا وتی: ئۆلیڤێر دەیەوێ بمهێنێ و دەبێ بە باوکم بڵێین.

تابورێت وتی: بەڵێ، بۆ ماڵی پادشا دەچم و پێی دەڵێم کە ئۆلیڤێر دەیەوێ تۆ بێنێ.

G. تابورێت بۆ ماڵی پادشا چوو. پادشا لە گەڵ هەموو پیاوە گەورەکانی وڵات دانیشتبوو. وتی: پیرم و بەم زووانە دەمرم ... شازادە دەبێتە شاژن و بەجێی دێلم. شازادە جەحێڵە و بەڵام شاژنێکی باشی لێدەردەچێ.

پاشان تابورێت بە پادشای وت: لەگەڵم . وەرە دەبێ شتێکت پێ بڵێم ... بەم شێوەیە پادشا لە گەڵ تابورێت چووە دەرێ

و پێی وت: تۆ نابێ شازادە بکەیە شاژن! چونکو ئەو شازادەیەکی راستی نییە و لەیستۆکییە.

پادشا وتی: لەیستۆکییە؟! ئایا دەڵێی شازادەکەم ئۆرسۆلا لەیستۆکییە؟!

تابورێت وتێ: بەڵێ لەیستۆکییە . . . .

H. پادشا زۆر توورە بوو. بە بەردەستەکەی (راژەوان) وت: شازادە بۆ نێو دیوەکە بێنە . . . ئەو لەیستۆکی نییە . .

ئەمجار شازادە لەیستۆکییەکە هاتە نێو دیوەکە و زۆر باش بوو. وەختێ قسەی دەکرد کە لە گەڵیا قسەت بکردایە. دەیوت: بەڵێ . . . نا . . . تکایە . . . سپاست . . . وایە.



قەت هەرا و قیژەی ساز نەدەکرد قەتیش کایەی نەدەکرد تەنیا شتێکی دەکرد کە پێی وترابایە.

تابورێت چووە لای شازادە لەیستۆکییەکە. لێیدا، سەری کەوتە خوارێ. سەرەکە وتی: سپاست . . . تابورێت وتی: ئەوە شازادە لەیستۆکییەکەیە و من شازادە ئۆرسۆلات بۆ دێنم. بۆ حەوت رۆژ لە گەڵت دەبێ. ئەگەر ئێوە بە بوونی

PDF 4 KURD

خۆشحاڵ نەبن، دووری دەخەمەوە ... ئەگەریش ئەو پێی خۆش نەبێ لە گەڵتان بێ دەیبەمەوە ...

I. تابورێت رۆیی و ئۆرسۆلای هێنا. ئۆرسۆلا بۆ پادشا هات و کاتێ قسەی دەکرد ژنەکانیماڵی پادشا دەیانوت: ئەی وەی ئەوندە زۆر قسە مەکە ... تەنیا بڵێ، بەڵێ .. نا .. تکایە ... سپاست ... وایە. هیچ شتێکی تر مەڵێ.

ئۆرسۆلا کایەی دەکرد. بەڵام هەموو پێیاندەوت: ئەح! نابێ کایەی بکەی. تۆ لای خۆی شازادەیەکی.

ئۆرسۆلا هەڵاتە نێو باخەکە و کردیە شلووقی و هەرا و قیژە. بەڵام هەموویان دەیانوت: تەح! نابێ هەڵێیە نێو باخەکەو هاروهاجی بکەی. تۆ لای خۆی شازادەیەکی.

خەڵکانی نێو ماڵی پادشا ئۆرسۆلایان خۆشنەدەویست.

G. ئۆرسۆلا لە ماڵی پادشادا خۆشحاڵ و بەکەس نەبوو و هیچ کەسیش خۆشی نەدەویست. دەیانوت: ئەم شازادەیەمان ناوێ ... هینەکەی خۆمان (لەیستۆکییەکە) بدەنەوە دوای حەوت رۆژان تابورێت گەڕایەوە. بە ئۆرسۆلای وت: دەتەوێ لە ماڵی پادشادا بمێنییەوە؟ خۆشحاڵی؟ ئۆرسۆلا دەستی کردە گریان و وتی: نا .. نا .. بمبەوە بۆ ماڵی ماسیگرەکە .. بمبەوە بۆ ماڵی ئۆلیڤێر. لە ماڵی پادشادا خۆشحاڵ نیم.

تابورێت بە پادشا و هەموو گەورە پیاوانی ئەو وڵاتەی وت: ئایا شازادە ئۆرسۆلاتان خۆش دەوێ و پێی خۆشحاڵن؟

PDF 4 KURD

پادشا و هەموو گەورەکان وتیان: نا . . نا . . خۆشمان نـاوێ . . شازادە لەیستۆکییەکە بێنەوە.

K. ئەمجار تابورێت سـەری شـازادە لەیسـتۆکییەکەی گـرت و دایناوە. شازادەکە وتی: سپاستان. . . وایە . .

خەڵـکانی نێـوماڵـی پادشـا زۆر خۆشـحاڵ بـوون و وتیـان: شازادەکەمان ببیسـتە . . ئـەو دەڵـێ: سپاسـتان . . . وایـە . . . ئەو شاژنێکی زۆر باش دەبێ . . .

تابورێت ئۆرسۆلای بە دەست هەڵگرت و چوونـە ژوور تـەپ ودارستان و چۆمەکە. هاتنەوە بۆ ماڵی ماسیگرەکە. ئۆرسۆلا بووە ژنی ئۆلیڤێر و زۆر خۆشـحاڵ بـوو و منداڵـێکی زۆریـان بوو. منداڵەکان کایەیان دەکرد و شـلووقی و هـەرا و قیژەیـان سـاز دەکـرد . قـەت نـەیانوت: «تکایـە» قـەتیش نـەیانوت: «سپاستان»

PDF 4 KURD

پرسیارەکان

## لە نێو ئاورەکە

A. ١ـ جەک لە کوێ دەژیا؟
٢ـ بۆچی جەک نەیدەتوانی بڕوا؟
٣ـ کێ لەسەر ئاورەکە دانیشتبوو؟ ٤ـ پەرییەکە وتی: "ئایا دەتەوێ ببینی ........؟ چی؟
B. ١ـ جەک لە هەموو لایەکەوە چی دی؟
٢ـ گوڵەکان لە چی دروست بوبوون؟
٣ـ درگا و پەنجێرەکان لەچی درووسکرابوون؟
C. ١ـ قژی شازادە (پرینسێس) شێوەی چی دەدا؟
٢ـ بۆچی شازادە (پرینسێس) بە پەرۆش بوو؟
٣ـ بۆچی شازادە دەستی شازادەی ئاو ناگرێ؟
D. ١ـ بۆچی پادشا لە شازادە (پرینسێس) تووڕەیە؟
٢ـ پادشا کێی ویست تا لەگەڵ شازادەدا ببێتە هاوسەر؟
٣ـ جەک لە کوێ بوو کاتێ چاوی هەڵێنا؟
٤ـ ئایا جەک شازادەی ئاوی دی؟
E. ١ـ کێ لە سەر گڕی ئاورەکە دانیشتبوو؟
٢ـ جەک دەبێ چی لەسەر ئاورەکە دابنێ؟
٣ـ شازادە (پرینسێس) چی لە جەک پرسی تا بیکا؟
F. ١ـ چاوانی شازادە (پرینسێس) لە چی دەچوون؟
٢ـ کێ دەتوانێ یاریدەی (میر) شازادە و پرینسێس بدا؟
٣ـ کێ بۆ وڵاتی بەفری دەچێ؟
G. ١ـ (شازادەی ئاو) میراو کێ بانگ دەکا؟
٢ـ وڵاتە دوورەکە بەچی داپۆشرابوو؟
٣ـ پیاوی بەفرین لەکوێ دانیشتبوو؟
H. جەک چەن شتی دەتوانی لە پیاوی بەفرین بپرسێ؟

PDF 4 KURD

٢ـ شازادەی ئاو دەبێ چ بکا؟
٣ـ شازادەی ئاو دەبێ چ بڵێ؟
I. ١ـ شازادەی ئاور لەکوێ بوو؟
٢ـ شازادەی ئاو (میراو) وتی: "هەریەک لە ئێمە .... بەڵام ..
J. کاتێ شازادەی ئاو (میراو) دەستی پرینسێسی گرت چ روویدا؟ ......زۆر ......
K. ١ـ کێ بە نێو پەنجێرەکەداهات؟
٢ـ پەرییەکان چییان بۆ جەک هێنا؟
٣ـ کێ پیشانی دان کە ئەم شتە چۆن دروسکەن؟
٤ـ کاتێ جەک کەواکە لەبەر بکا چی بەسەر دێ؟
L. ١ـ بۆچی جەک نەیدەتوانی کەواکە ببینێ؟
٢ـ جەک توانی چ بکا؟
٣ـ جەک وتی: "زۆر سپاستان." پەرییەکان چییان وت؟

## پشیلە و کەوشەکان

A. ١ـ پیاوەکە چی بەتام دا؟
٢ـ تام دەبێ چ بۆ پشیلەکە بکڕێ؟ A........B.......
٣ـ تام چی دەبێ؟
٤ـ تام لەکوێ (لە داهاتوودا) ژیان دەکا؟
٥ـ تام کێ مارە دەکا؟
B. تام چی لە نێو توورەکەکەدا دانا؟
٢ـ چی چووە نێو توورەکەکەوە؟
٣ـ پشیلەکە توورەکەکەی بۆ کوێ برد ؟
٤ـ پشیلەکە بە پادشای وت: "من ........"
C. ١ـ پشیلەکە چی لە رۆژی دواتر گرت؟
٢ـ پادشا لەکوێ سوار بوو؟
٣ـ تام لە کوێ جلەکانی داکەند؟

PDF 4 KURD

٤ـ پشیلەکە چی دوور خستەوە؟
D. ١ـ پشیلەکە بۆچی گریا؟
٢ـ پادشا لەکوێ تامی دی؟
٣ـ پادشا جی بە تام دا؟
E. ١ـ کێ لە خانووە گەورەکەدا دەژیا؟
٢ـ دێوەکە دەیتوانی خۆی بکاتە چی؟
٣ـ پشیلەکە وتی: "تۆ ناتوانی خۆت بکەیتە . . . "
F. ١ـ دێوەکە خۆی کردە چی؟
٢ـ پاشان پشیلەکە وتی: "ناتوانی خۆت بکەیتە . . . . .
٣ـ پشیلەکە پاشان چی کرد؟
G. ١ـ کێ بە رێگاکەدا بڕێ دوایی هات؟
٢ـ پشیلەکە چی پیشانی پادشا و شازادە دا؟
٣ـ تام کێی هێنا؟

## ئالیس

A. ١ـ بۆچی شاژن باش نەبوو؟
٢ـ ئایا پەرییەکان شاژنیان خۆشدەویست؟
٣ـ شاژن چی نەدەویست؟
B. ١ـپەرییەکە لە کێی شتێ هەڵگرت؟
٢ـ شتێ منالێکی چکۆلە دەبا: A. لە چی دەچوو؟ B. بۆ کوێ چوو؟
C. ١ـ کێ لە بەر پەنجێرەکە دانیشتبوو؟
٢ـ ئالیس کێی خۆشدەویست؟
٣ـ ئالیس چەند رفێقی هەبوو؟
D. ١ـ نێوی میر (پرینس) چ بوو؟
٢ـ کێ لە ماڵی سەر تەپەکە دەژیا؟
٣ـ پادشا و شاژن لە کێ ترسابوون؟
E. ١ـشازادە پیتێر زۆر جاران بۆ کوێ دەچوو؟

٢ـ لە یەکێ لە کتێبەکان چ شتێ بوو؟
٣ـ وێنەکان چۆن بوون؟
٤ـ شازادە پیتێر کێی لە وێنەکەدا دی؟
F. ١ـ شازادە پیتێر چی لە جادووگەرەکە پرسی؟
٢ـ شازادە پیتێر دەچوو تا کێ ببینێ؟
G. ١ـ شازادە پیتێر چ جلوبەرگێکی لە بەر کردبوو؟
٢ـ شازادە ئالیس لەکوێ بوو؟
٣ـ شازادە پیتێر چی لە جادووگەرەکە پرسی: "بۆچی شازادە ئالیس ....."
H. ١ـ پەرییەکە چی دوور خستەوە؟
٢ـ ماڵە شینەکە لەکوێ بوو؟
٣ـ لە دەرەوەی ماڵەکە چی لێیە؟
٤ـ بۆ چەند ساڵان شازادە پیتێر دەبێ کار بکا؟
٥ـ شازادە پیتێر نابێ چ لە نێو ماڵەکەدا بکا؟
I. ١ـ مارەکە دوای سێ ساڵان چی دەکا؟
٢ـ پاش چەند رۆژ، سێ ساڵەکە تەواو دەبێ؟
J. ١ـ کێ بۆ لای پیتێر هات؟
٢ـ ئەو چی پرسی؟
٣ـ ئایا پیتێر لەگەڵ شاژنەکە قسەی کرد؟
٤ـ ئایا پیتێر خواردی؟
K. دەرگا لە چی دروستکرابوو؟
٢ـ چی لە دیوەکەدا بوو؟
٣ـ چی لەسەر میزەکەدا بوو؟
٤ـ نزیک سنووقەکە چی لێبوو؟
٥ـ نێو سنووقەکە چی تیابوو؟
L. ١ـ بۆچی خەڵکێکی زۆر لە شەقامدا بوون؟

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

٢ـ کێ ئالیسی هێنا؟

٣ـ خزمەتکارەکان چییان بە پیتێر وت؟ ناتوانی بچیە ژوورەوە . .

**M**. ١ـ شازادە پیتێر لە کوێ دانیشت؟

٢ـ کێ لەگەڵ پادشادا بوو؟

٣ـ شازادە (پرینسێس) شووی بە کێ کرد؟

## عەلی و توتییەکە

**A**. ١ـ بۆچی باڵندەکە نەیدەتوانی هەڵێ؟

٢ـ عەلی لە کوێ باڵندەکەی هەڵگرتەوە؟

٣ـ باڵندەکە چی توانی بکا؟

٤ـ باڵندەکە بە عەلی وت دەبێ چی قسە بکا؟

**B**. ١ـ عەلی لەکوێ دانیشت؟

٢ـ باوکی عەلی چی وت؟

٣ـ مۆستاکە چی وت؟

**C**. ١ـ ناوی براکەی عەلی چ بوو؟

٢ـ عەبدول چی بردە نێو دارستانەکە؟

٣ـ باڵندەکە بە عەبدولی وت چ بکا؟

**D**. ١ـ ئایا عەبدول بە ئینگلیسی قسەی کرد؟

٢ـ ئایا مناڵەکانی تر باڵندەکەیان دیتەوە؟

## شازادەی شاراوە

**A**. ١ـ شازادە ئان چی پێخۆشبوو؟

٢ـ شازادە چی وت؟

٣ـ هەر رۆژ چەند شازادە دەهاتن؟

**B**. ١ـ ئایا جان دەوڵەمەن بوو؟

٢ـ جان لە کوێ دانیشت؟

٣ـ کێ بە رێگاکەدا هات؟

٤ـ ژنەکە چی لە شازادە جان پرسی؟

C. ١ـ چەند شازادە لە ئان دەگەڕان؟
٢ـ شازادەکەی تر کوێی پیشان نەدا؟
D. ١ـ شازادە ئان لە کوێ بوو؟
٢ـ منداڵانی شازادە حەزیان لە چی دەکرد؟

## نانی کلۆڵی

A. ١ـ نانەواکە چی دەکا؟
٢ـ نانەواکە نانەکەی دەخستە کوێوە؟
٣ـ کێ هاتە نێو دیوەکە؟
٤ـ پەرییەکە لە کوێ ویستی بمێنێتەوە؟
B. ١ـ نانەکە هەموو کەسێ چ لێدکا؟
٢ـ نانەواکە لە چیدا نانەکانی بۆ ماڵان دەبرد؟
C. ١ـ کاک ئای چی دەگرد؟
٢ـ بۆچی کاک ئای بەختەوەر بوو؟
٣ـ کاک ئای چی خوارد؟
٤ـ کاک ئای چی لەبارەی کەوشەکانی، پاش خواردنی نانەکە وت؟
D. ١ـ کاک بی چی دەکرد؟
٢ـ بۆچی کاک بی بەختەوەر بوو؟
٣ـ کاک بی چی لە بارەی ماسییە گەورەکانی، پاش خواردنی نانەکە وت؟
E. کاکی سی چی دەکرد؟
٢ـ بۆچی کاک سی بەختەوەر بوو؟
٣ـ کاک سی چی لەبارەی کەواکەیەوە، پاش خواردنی نانەکە وت؟
F. ١ـ بۆچی نانەواکە بەختەوەر بوو؟
٢ـ نانەواکە بە کوێدا دەڕۆیشت؟
٣ـ کاک ئای، کاک بی و کاک سی چییان لەبارەی نانەواکەوە وت؟
بۆچی . . . . کاتێ ئێمە . . . . . .

PDF 4 KURD

٤ـ ئەوان چییان بە سەر ماڵی نانەواکەدا هێنا؟
G. ١ـ وەختێ ماڵی نانەواکە دەسووتا، چی هاتە دەرێ؟
٢ـ کاک ئای،کاکبی و کاکسی وەختێ پەرییەکەهەڵاتچییان وت؟
٣ـ چییان بۆ نانەواکە دروست کرد؟

## سیگفرێد و هاندا

A. ١ـ دێیەکە لە کوێ بوو؟
٢ـ ڕاڵف کێ بوو؟
٣ـ جان چی دروست دەکرد؟
٤ـ نێوی کچە چکۆلانەکەی جان چی بوو؟
B. ١ـ پیاوە پیرە ناحەزەکە چی بە پشتەوە بوو؟
٢ـ لیسبێس چی کڕی؟
٣ـ نێوی ڕفێقەکەی لیسبێس چ بوو؟
٤ـ هەموو خەڵکی نێو دێیەکە بە زوویی چییان کرد؟
C. ١ـ بۆچی ڕاڵف نەیدەزانی خۆی چۆن بەخێو کا؟
٢ـ دار و گوڵەکان بە هۆی چییەوە هەڵپرووکان؟
٣ـ باوکی لیسبێس بۆچی گریا؟
D. ١ـ ڕۆژی دواتر کێ گوم بوو؟
٢ـ کێ ئێستاش لە دێیەکەدا مابۆوە؟
٣ـ سیگفرێد چی دا بە هاندا؟
٤ـ لە ڕۆژی دواتر کێی دیکەش گوم بوو؟
E. ١ـ سیگفرێد چی لە دارستانەکەدا دی؟
٢ـ کەروێشکەکە لە کوێ هەڵنیشتبوو؟
٣ـ کچۆڵەکان لە کوێدا بوون؟
٤ـ پیرە پیاوە ناحەزەکە چی لێدەهات ئەگەر نەیتوانیبایە کچە چکۆڵەکان بگرێ؟
F. سیگفرێد دەبێ چی لە سەر بەردە گەورەکە دابنێ؟

PDF 4 KURD

٢ـ سیگفرێد چی لەو شوێنە دەبینێ کە ئاورەکەی لێ بوو؟

G. ١ـ کێ یاریدەی سیگفرێدی دا تا گشت کەوشەکان خڕ کەنەوە؟

٢ـ سیگفرێد کەوشەکانی لە کوێ دانا؟

٣ـ سیگفرێد چی دەبینێ کاتێ کەوشەکان سووتێنران؟

H. ١ـ سیگفرێد لە کونەکەدا چی دی؟

٢ـ کاتێ سیگفرێد کەوشەکانی لە پێ داکەند هاندا چی کرد؟

I. ١ـ بۆچی خەڵک پیرە پیاوە ناحەزەکەیان نەکوشت؟

٢ـ کێ هاندای هێنا؟

٣ـ کاتێ راڵف پیر بوو کێ کەوشی بۆ خەڵکی نێو دێ دروست دەکرد؟

## دێی تاڵە جاڵجاڵووکەی زێڕین

A. ١ـ ژنەکە لە دێیەکەدا چی دروست دەکرد؟

٢ـ ئەگەر بێتو درگای ماڵەکە دانەخەی، چ شتێ دێ؟

٣ـ پێرکتا کێ بوو؟

٤ـ پێرکتا چی هەبوو؟

B. ١ـ دایکی فلۆریس چی دروست دەکرد؟

٢ـ ئایا دایکی فلۆریس فێری کرد کە چۆن پارچە (کوتاڵ) دروست کا؟

٣ـ بۆچی فیلیپ و فلۆریس نەیاندەتوانی ببنە هاسەری یەکتر؟

C. پادشا داوای چی کرد؟

٢ـ پادشا بۆ پارچەکە چی دەدا؟

٣ـ پادشا بۆچی توورە دەبێ؟

D. ١ـ فلۆریس چەند مریشکی بوو؟

٢ـ کێ وتی «هۆی»؟

٣ـ پشیلەکە کێی بانگ کرد؟

٤ـ رەشمەل چی دێنێ؟

٥- پشیلەکە چی بە مریشکەکان وت تا بیهێنن؟
E. بۆچی رەشمەل نەیدەتوانی پارچەی زێڕین دروست بکا؟
٢- بۆچی پشیلەکە نەیدەتوانی پارچەی زێڕین درست بکا؟
٣- ئایا کەسێ بوو کە خوازبێنی مریشکەکان بکا؟
F. ١- چی هاتە ژوورەوە؟
٢- رەشمەل بۆ کوێ چوو؟
٣- سەگەکە چی پرسی؟
G. ١- پێرکتا کێی بانگ کرد؟
٢- سەگەکە لە کوێ هەڵدەبەزێتەوە؟
٣- فلۆریس چی لە دیوەکەی تردا دی؟
٤- کەی دایکی گوم بۆوە؟
H. ١- پادشا بۆ چ شتێ پارەیەکی زۆری دا؟
٢- بۆچی ئەمساڵ زۆر خۆش دەبێ؟

## شازادەی لەیستۆکی

A. ١- منداڵەکان لە گەڵ چیدا کایەیان دەکرد؟
٢- منداڵەکان لە گەڵ شتومەکی کایە چی دەکەن؟
٣- تۆ لە کوێ شتومەکی کایە دەکڕی؟
B. ١- تابورێت کێ بوو؟
٢- کاتێ شاژن شلووقی دەکرد، پادشا چی دەکرد؟
٣- نێوی شازادە چکۆلەکە چی بوو؟
C. ئایا شازادە هیچ شتومەکی کایەی بوو؟
٢- وەختێ شازادە قسەی دەکرد پادشا چی دەوت؟ بڵێ . . .
٣- کێ هات تا شازادە ببینێ؟
D. ١- تابورێت بۆ کێ چوو؟
٢- تابورێت داوای چی کرد؟
٣- دوای چەند رۆژ ئەم شتە ئامادە دەبێ؟

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

E. ١ـ تابورێت لە کوێدا ئۆرسۆلا هەڵدەگریٚ؟
٢ـ تابورێت چی لە جێگاکەی ئۆرسۆلا دادەنیٚ؟
F. ١ـ وەختیٚ ئۆرسۆلا کەورە بوو، شازادە لەیستۆکییەکە چی لێدەهات؟
٢ـ شازادە لەیستۆکییەکە چی دەوت؟
٣ـئۆلیڤێر ویستی چ بکا؟
G. ١ـپادشا لە کویٚ دانیشتبوو؟
٢ـ کیٚ دەبێتە شاژن؟
٣ـ تابورێت چی بە پادشا وت؟
H. ١ـ پادشا چی لە خزمەتکارەکانی ویست تا بیکەن؟
٢ـ تابورێت بۆچی شازادە لەیستۆکییەکەی ویست؟
٣ـ بۆ چەند رۆژان ئۆرسۆلا لە گەڵ پادشا دەبیٚ؟
I. ١ـ ئۆرسۆلا بۆ کویٚ هات؟
٢ـئۆرسۆلا بۆ کویٚ هەڵات؟
٣ـ ئایا خەڵک لە ماڵی پادشادا ئۆرسۆلایان خۆش دەویست؟
J. ١ـ ئایا ئۆرسۆلا لە ماڵی پادشادا خۆشحاڵ بوو؟
٢ـ تابورێت بە ئۆرسۆلای وت: « ئایا دەتەویٚ لە ماڵی پادشادا بی؟» وەڵامی ئۆرسۆلا چ بوو؟
٣ـ تابورێت بە پادشای وت "ئایا شازادەت خۆشدەویٚ؟" وەڵامی پادشا چ بوو؟
K. ١ـ تابورێت چی لە پشتەوەی دانا؟
٢ـ شازادە لەیستۆکییەکە چی وت؟
٣ـ ئۆرسۆلا بووە چی؟
٤ـ منداڵەکانی ئۆرسۆلا ، قەت، چییان نەدەوت؟